# خۆڕاگریی
## دەڤەری پشدەر
**(گێڕانەوەی چەند راستییەکی مێژوویی)**

**ستار حەمەتاهیر**

هەولێر - ٢٠١٠



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **خۆڕاگریی دەڤەری پشدەر**
- بابەت: گێڕانەوەی چەند راستییەکی مێژوویی
- ئامادەکردنی: ستار حەمەتاهیر
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن

پێداچوونەوەی زمانەوانی: حەمە ئەحمەد جاف

- پیتچنین: هەرێم عەبدولڕەحمان
- بەرگ: وریا بوداغی
- ژمارەی سپاردن: (٩١٠)
- نرخ: (٢٥٠٠) دینار
- چاپی یەکەم
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی رۆژهەڵات

**زنجیرەی کتێب (٤٩٤)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

## وتەیەکی پێویست

زۆرن ئەوانەی دوورو نزیك ئاگاداری ئەم رووداوو چەرمەسەریانەن کە لە مێژووی ئەم چەند ساڵەی دواییدا بەسەر ئەم وڵاتەدا هاتوون و لە ئەنجامی ئەمانەشدا چەندین کەس گیانیان بەخشی، چەندانیش ماڵ و سامانییان فەوتا و چەند شارو لادێ بوون بە قوربانی سیاسەتە چەوتەکانی رژێمی بەعس. بەڵام ئەوەی نووسرابێتەوە بە بەراورد بەم هەموو دەردەسەری و نەهامەتیەی بەسەر ئەم گەلەدا هات، زۆر کەم. بۆیە گەر هەر یەکێك لە ئێمە بتوانێ تاکە لاپەڕەیەك بۆ دەرخستنی ئەم رووداوانە بخاتە بەرچاو، ئەوە پێموایە کارێکی گەورەیە، چونکە دەبێت بە هۆیەك بۆ ئەوەی نەوەکانی ئەمڕۆ شارەزاییەك پەیدا بکەن سەبارەت بە مێژووی پڕ سەروەری گەلەکەیان.

خوێنەری بەڕێز، ئەم چەندلا پەڕەیەی ئێستا لە بەردەم چاوە گەشەکانتە بریتییە لەو رووداوانەی (ستاری حەمە تایەر) وەك شایەتحاڵێك و بەشداری تێدا کردووە. گرنگترینی ئەم رووداوانەش بریتیە لە چۆنیەتی خۆڕاگریی خەڵکی پشدەر بەرامبەر بە زەبروزەنگ و دوژمنکاری رژێم لە کاتی شالآوی راگواستندا.

ئەوەی لێرەدا لەبەر دەستتە، بریتیە لە دڵۆپێك لە دەریایەك، بریتییە لە گوڵێك لە ناو باخی پڕ گوڵزاری داستان و سەروەریەکانی ئەم گەلە، ئەوە تەنها بەشێکە لەم رووداوانەی کە تاکێك لە تاکەکانی ناوچەی پشدەر دەیگێڕێتەوە و، دەیکات بە نموونەیەك بۆ یەکێك لە گەورەترین تاوانەکانی جینۆسایدی رژێم بەرامبەر گەلی کورد، کە ئەویش تاوانی راگواستنی زۆرەملێ بوو. وەك دەزانین رژێمی بەعس جگە لە وێرانکردن و خاپوورکردنی هەزارەها لادێی کورد، لە یەکێك لەم شالآوە نەگریسانەی ناوەندی قەزای پشدەردا، چەند شارۆچکە و ئۆردوگا و لادێیەکی ئەم ناوچەیەی بەسەریەکدا رووخاند و، خەڵکەکەی بەسەر چەند ئۆردوگایەکدا دابەشکرد و ئەو



ناوچەیەی کرد بە ناوچەیەکی قەدەغەکراو. بەم سیاسەتەشی وایزانی بەسەر گیانی نەتەوە پەروەری و کوردایەتیدا زاڵبووەو دەبێت. نەیزانی ئەم رق و کینەیەی لە دەروونی ئەم خەڵکەدا هەوێنی کردووە، رۆژێك وەك بورکانێك دەتەقێتەوە و بە تەواوی تەخت و تاراجیان را دەماڵێت.

ئەوەبوو دیتمان، ئەو بورکانە لە شێوەی راپەڕینێکی سەرتاسەری خەڵکی کوردستاندا تەقییەوە و هەموو شارو شارۆچکەکان لە ماوەی چەند رۆژێکی کەمدا بوون بە گۆڕستانێك بۆ بەعسیە ئەنفالچیەکان.

هەروەکو ئامادەکار خۆی لە پێشەکیدا ئاماژەی پێ دەکات، ئەو مێژوو نانووسێت، بەڵام شتێکی دیوە و بە پێویستی دەزانێت دوای خۆی نەوەی تازەی ئەم گەلە، بە تایبەتی گەنجانی ئەمڕۆی پشدەر پێی ئاشنا بن. ئەم بابەتانە لە یادەوەری ناوبراودا مابوون و خەڵکانێك ماوەیەکە هانی دەدەن تا بیخاتە سەر پەڕەی تۆمارێك، ئەمەبوو کاتێك کە خاڵم باسی نووسینی ئەم بابەتەی کرد، زیاتر هانم داو بەڵێنم پێدا هاوکاری بکەم، هەرچەندە من کاتی راگواستنەکە تەنها هەرزەکارێك بووم، بەڵام زۆر لەو رووداوانەم لەبیرە. لە بیرمە کاتێك کە بە سەردان دەچووینە قەڵادزێ، رووداو و کارەساتی جۆراوجۆر لە داستانی قارەمانانە و شەڕو تۆپباران و خۆپیشاندانەکان دەبوون بە بەشێك لە ژیانمان. بۆیە بە شانازیەوە ئەرکی رێکخستنەوەی بابەتەکان و پێداچوونەوەی زمانەوانیم خستە ئەستۆی خۆم.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بەوەش بکەم، نووسینەکە بە زمانی سادەی خەڵکی ناوچەکە نووسراوە، لە کاتی پێداچوونەوەیدا نەمانوویست لە زۆر وتن و دەربڕیندا دەستکاری لایەنی زمانەوانیان بکەین تا مۆرکی ئەم ناوچەیەی پێوە بمێنێت، هیوادارین بەرهەمەکە جێگای رەزامەندی بێت و شایانی ئەم هەموو قوربانی و خەباتە بێت کە خەڵکی ئەم ناوچەیە پێشکەشی کردووە.

**دەریا جەمال حەوێزی**
**مامۆستای ئەدەبی کوردی**
**زانکۆی کۆیە/٢٠٠٩**

# پێشەکی

من لە تۆماری ئەم یادەوەریەدا، چەمکێك لە بەسەرهاتی خۆم وەك تاکێکی ئەم ناوچەیە، سەبارەت بەو هەموو ستەمەی لێمان کرا و ئەو ماڵوێرانی و دەردەسەریانەی لەم چەند ساڵەدا توشمان بوو، دەخەمە روو. هەروەها ئاماژەیەکە بۆ خۆڕاگریی ئەم خەڵکە بەرامبەر شاڵاوی راگواستن، کە رژێمی لەناوچووی عێراق بەرامبەر ئەم ناوچەیە ئەنجامیدا.

لێرەدا ئەوەی لەم رووەوە دەشێت و دەکرێ بگوترێ بەشێکی لێدەخەمە بەرچاو، بۆ ئەوەی رۆڵەی ئەمڕۆی شارەکەمی پێ ئاشنا بکەم، تا زانیاریەك لە سەر مێژووی خۆیان بزانن و هەردەم خاك و وڵاتی خۆیان خۆش بوێت و بیپارێزن.

جا ئەوەی من لەم نامیلکەیەدا باسی دەکەم و لێی دەدوێم، بریتیە لە کورتەی کۆمەڵە رووداوێکی مێژوویی ئەم ناوچەیە، لە ماوەی نێوان بۆردوومانە خوێناویەکەی ١٩٧٤/٤/٢٤ تا بەرواری ١٩٩١/٣/٦، واتە تاکو راپەڕین. هەروەها جێی ئاماژە پێکردنە، مامۆستا **تەها بابان** لە چوارچێوەی پەڕتوکێکی باشی دیکۆمێنتی، مێژوویی بەشێك لە کارەساتی بۆردوومانەکەی بڵاوکردۆتەوەو، باسی لوێچێك لە دڕندایەتی ئەنجامدەرانی ئەم بۆردوومانەی کردووە. بەرێزیان زۆر خۆی هیلاککردووە، گەڕاوە بە دوای شاهید حاڵەکانداو چیان بۆ باس کرد بێت ئەوها نوسیوویەتی. ئەگەر کەسێك گلەیی لە مامۆستا **تەها بابان** بێت، ئەوا غەدری لێ دەکات، چونکە زانیاریەکانی وەك چۆن بۆیان گێڕاوەتەوە ئاواش نووسیوویەتەوە. وەك دەڵێن نەفرەت لەو کەسەی رووداوی مێژوویی وەك خۆی ناگێڕێتەوە. چەندجار خۆم لەگەڵی دانیشتووم و زانیاری زۆری لێ وەرگرتووم و منیش بە ویژدانەوە بۆم گێڕاوەتەوە. بەڵام لە کاتی بڵاوکردنەوەی پەڕتووکەکەیدا لەمەڕ کارەساتی ١٩٧٤/٤/٢٤دا هەندێك شت لە بیرکرا بوو. بەهەرحاڵ دەستخۆشی لێ دەکەین کە بەم تەمەنە ئەو زەحمەتەی کێشا. شەوێك لای دانیشتم



فەرمووی دەترسم بمرم فریا نەکەوم ئەم پەڕتووکە بڵاو بکەمەوە. ئێستا کە ئەو باسە لەبەردەستمە و لێی دەدوێم، هەندێکم بۆ باسکرد، فەرمووی: بمدەرێ دەیکەم بە پەرتووکێك لەسەر ئەرکی خۆم و بە ناوی تۆوە چاپی دەکەم. لە راستیدا زۆر هانی دام ئەم باس وخواسانە بکەم بە نامیلکەیەك.

جگە لەمەش زۆر جار لە کاتی بیرەوەری و یادەوەریەکاندا دەزگا راگەیاندنەکان چاوپێکەوتنم لەگەڵدا دەکەن و، هانیان داوم ئەم زانیاریانە بکەم بە پەڕتووکێك. ئەوا منیش بە نەشارەزایی لە بواری نووسین، کوێرانە لێی وەخۆکەوتم. وەك شاهیدحاڵێك لە رووداوەکانی ناوچەکە، چیم بینیووە هەروەك خۆی لێی دەدوێم و باسیان دەکەم. هەرچەندە من ئەو هەقە نادەم بە خۆم لە بواری مێژوو شت بنووسم، بەڵام ئەوەی کە باسی دەکەم بەشێکە لە یاداشتەکانی تایبەت بە ژیانی خۆم. وەك هەرتاکێکی ناوچەی پشدەر رۆژانە ئەو رووداوانەم بینیووە،بەڵام وەك خولیایەك بەردەوام لە دەفتەری یادەوەریەکانمدا تۆمارم کردوون. ئاگاداری زۆر  شت بووم، بۆیە ئیستا ئەو زانیاریانە دەردەهێنم و لێکیان دەدەم، تا بزانم شتێکی ئەوتۆیان لێ پێك ناهێنم بە کەڵکی خوێندنەوەی ئەمڕۆ بێت. ئەوەی لەم چەند لاپەڕەیەشدا باسم کردووە، زەکاتی سەرخەرمانە.

بێگومان کوێرەوەری و ناخۆشیەکان و زەبروزەنگی رژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق زۆر لەوە زیاترە کە من باسی دەکەم. مێژوویەکی کۆنتری هەیە، بەڵام وەك ئاماژەم پێکرد، ئەوەی من هەڵمبژاردووە و لە دووتوێی ئەم لاپەڕانەدا لێی دەدوێم، ئەو واقع و روداوانەن لەتەمەنی لاویمدا تیایاندا ژیاوم و لە بیرم ماون. رووداوەکان تایبەتن بە ماوەی دوای بۆردوومانەکەی ساڵی (١٩٧٤)ەوە تا ئەو راپەڕینە مەزنەی بوو بەبەشێك لە هەوێنی رووخاندنی رژێم و، دواتر ئاوەدانکردنەوەی دووبارەی قەڵادزێ و ناوچەی پشدەر. دیارە هێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە هەمووشتێك باس بکرێ تا کاتی خۆی دێ. دیارە گێڕانەوەی مێژوو و بەسەرهات بە دڵی هەموو کەس نابێت, گرنگ ئەوەیە ئەوەی دەیگێڕێتەوە بە ویژدان بێت.

**ستار حەمەتاهیر**

# ناساندنێکی کورتی ناوچەکە

***پشدەر*** قەزایەکە لە باشووری کوردستان. دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی شاری ***ڕانیە***. دەشتێکی بەرفراوانە و هەرچوار دەوری بە زنجیرە چیای سەخت دەور دراوە. ڕووبەرەکەی (٣٠٠ سێ سەد کم٢) دەبێت. ژمارەی دانیشتوانی لە(١٤٠) هەزارکەسە پترە. پێکهاتووە لە مەرکەزی شاری **قەڵادزێ** و ٤ شارەدێ و (١٨٦) سەدو هەشتاو شەش گوند. شارە دێیەکانی بریتین لە: **سەنگەسەر، ژاراوە، هەڵشۆ، هێرۆ، ئیسێو**.

سنووری ڕۆژهەڵاتی پشدەر بریتیە لە چیای **مامەندە، بلفەت، ملەبا، دووپەزە**. لە ڕۆژئاواشی چیای **کێوەڕەش** و شاری ڕانیەیە. لە باکوور زنجیرە چیای **قەندیل** و لە باشووریش زنجیرە چیای **ئاسۆس** و شاخی **کوڕپیس** دێت. هەروەها دوو ڕووباری گەورە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات بە دەشتی پشدەردا تێدەپەڕن و دەڕژێنە ناو بەنداوی دوکان کە بریتین لە: **زێی بچووك** و **چۆمی ژاراوە**.

پشدەر زۆر ناوچەی شاخاوی سەختی لێیە، وەك چیای کوڕپیس و زنجیرە چیای قەندیل. ئەم زنجیرە چیایانە بە دەیان چیا و دۆڵ و شیو ودارستانی چڕییان تێدایە. ئەوەندە سەختن ساڵانە زیاتر لە شەش مانگ بەفرییان لێ دەبارێت و هەرگیز بەفریان ناچێتەوە. لە زستاندا گوزەرانکردن لەم ناوچەیەدا زۆر سەختە، هەر بۆیەش بە درێژایی جەنگی عێراق — ئێران، پشدەر بەرەیەکی جەنگ بوو. هەرچەندە چیای قەندیل لەسەر سنووری نێوان ئەو دوو وڵاتەیە، بەڵام بە هۆی سەختی و دژواری ناوچەکە نە سوپای عێراق و نە ئێران نەیان توانی لە ژێر دەستی پێشمەرگەی دەربهێنن و پێگەی سەربازی لێ دابمەزرێنن. هەر کەسێك لە دژی ڕژێمی دەسەڵاتداری ئەو کاتەی عێراق هەڵوێستی وەردەگرتبا، خۆی دەگەیاندە بناری ئەو چیا سەرکەش و پێشمەرگە پارێزانە.

## پێکهاتەی دانیشتوانی پشدەر

دانیشتوانی پشدەرلە پێنج هۆزی سەرەکی پێکهاتووە، سنووری ئەم هۆزانە لێك جیان و بەم شێوەیە دابەشبوون:

١. هۆزی **ئاکۆ:** لە بەشی رۆژئاوای بناری **قەندیل** وداوێنی چیای **زێڕنە کێوی** دا نیشتەجێن.

٢. هۆزی **مەنگوڕ:** ئەم هۆزە لەگەڵ هۆزی ئاکۆ سنوریان هاوبەشەو لە بەشی رۆژهەڵاتی بناری **قەندیل** دا نیشتەجێن.

٣. هۆزی **مامەش:** لە هەردوو دیوی رۆژهەڵات و رۆژئاوای داوێنی چیای **مامندە** نیشتەجێن. زۆر گوندی کوردستانی دیوی ئێرانیش لەناو سنووری هۆزی مامەشدا نیشتەجێن.

٤. هۆزی **میراودەلی** واتا **ئاغاکانی پشدەر:** لە داوێنی چیای **بلفەت**، و گشت ئەو دەشتەدا نیشتەجێن کە بەسەر **زێی بچوك**دا دەڕوانێ، لە گوندی **قندۆڵ**ەوە دەسپێەکات تا گوندی **سندۆلان** و لە وێشەوە تا دەگاتە گوندی **هەڵشۆ**.

٥. هۆزی **نورەدینی:** واتە جووتیارەکانی دەشتی پشدەر، ئەمانەش لە دێرزەمانەوە لەگەڵ میراودەلیەکان لەو گوندانەدا بەیەکەوە دەژین.

زۆربەی دابونەریتی هۆز و عەشیرەتەکانی پشدەر لەیەك دەچن و ژن و ژنخوازی خزمایەتی لە نێوانیاندا هەیە.

خەڵکی پشدەر زۆر باش و میواندۆست و نانبدەن. پێشبڕکێ دەکەن لە میوان دۆستیدا. دەگێڕنەوە گوایە خاوەنماڵێك میوان زۆر رووی لە ماڵەکەی کردووە، دزی کردووە تا خزمەتی میوانەکەی بکا. زۆر کەس لە ناوچەکانی ترەوە بە میوانی یان بە



کاری میری هاتۆنەتە ناوچەکە و نەگەڕاونەتەوە ناوچەکانی خۆیان، ئێستاشی لەگەڵدابێ خۆیان بە پشدەری دەناسێنن.

ئەم دوو هۆیەی باسکران، یەکیان سەختی ناوچەکە، دووەمیان دابونەریتی جوانی خەڵك بەرامبەر میوان و میوانداری، وایکردووە هەردەم پشدەر ناوچەیەکی ئارام و گونجاو بێت، بۆ خەڵکی شۆڕشگێڕ و یاخی بوو لە رژێمەکانی ئێران و عێراق. هەمیشەش لانەی شۆڕش بووە، هەروەك چۆن لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلولدا، مەکتەبی تەنفیزی پارتی دیموکراتی کوردستان لەم ناوچەیە و لە گوندی هەڵشۆ بوو، لە دوای شۆڕشی ئەیلولیش بە هەمان شێوە بارەگا و سەرکردایەتی گشت حزبە کوردستانیەکان لەم ناوچەیەدا بوون. بوونی ئەم هەموو بارەگایە و بوونی خەڵکی شۆڕشگێڕ و تیکەڵاوبوونیان لەگەڵ خەڵکی ناوچەکە و هەندێ جار مانەوەیان لە ماڵەکان، کاریگەری تەواوی بەسەر هۆشیاری خەڵکەکەوە هەبووە. ئەمانە کارێکی وایان کردووە، خەڵکی ئەم دەڤەرە لە بواری کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتییەوە بە ئاگا و ئاگاداری رووداو و پێشهاتەکان بن. هەر بۆیە ئەگەر لەگەڵ جوتیارێکی هەژاری ناوچەی پشدەر دابنیشیت و بیدوێنی، بە بەراورد لەگەڵ خەڵکی زۆر لە ناوچەکانی دیکە، تێدەگەیت مرۆڤی بە ئاگا و وشیارە. ئەم خەڵکە وا هەڵکەووتوون بە ئاسانی دەستەمۆی کاربەدەستانی حکومەتکان نابن. زوڵم و زۆری رژێمی لە ناوچووی عێراقیشیان قبوڵ نەدەکرد. رژێم زۆر رێگەی گرتەبەر تا خەڵکەکە کۆنترۆڵ و دەستەمۆی مەرامی گڵاوی خۆی بکات، بەڵام بۆی نەکرا. هەمیشە خەڵك و رژێم دوو بەرەی دژبەیەك و نەگونجاو بوون. هەر کاتێك رژێم ویستبای شتێکی باش لە ناوچەکە بکات ئەوا خەڵك زۆر بە خراپ لێکی دەدایەوە، بۆ نموونە بیرم دێت لەم سەردەمەدا جارێك نەخۆشخانەی قەڵادزێ بانگەوازی بۆ دانیشتوانی ناوچەکە کرد تا کوتانی منداڵان ئەنجام دەدرێت، خەڵك زۆر بە دڵ پیسی و خراپ لێکی دەدایەوە بە گومان بوون دەیانگوت:

ـ ئەمە دەرزی نەزۆکیە لە پاشەڕۆژدا منداڵەکانمان نەزۆك دەبن. کەس منداڵی نەدەکوتا...خەڵکی وا لە رژێم بێزار ببوون، مردنی خۆیان پێ خۆش بوو تەنیا لە دەست ئەو رژێمە رزگاریان بێت. ماوەی هەشت ساڵی جەنگی نێوان عێراق و

ئێران، بەردەوام شاری قەڵادزێ لە لایەن سوپای ئێرانــەوە بۆردومــان دەکــرا. کــەم ڕۆژ هەبوو خەڵکی لێ شەهید نەکرێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکی ناوچــەکە لــە رقی رژێم پێیان خۆش بوو ئێران لەو جەنگەدا سەر بکەوێ.

ڕژێمی عێراق لە زەبروزەنگ و گرتن و لــە ســێدارەدان و بڵاوکردنــەوەی تــۆوی دووبەرەکی، درێغی نەکرد. بەڵام نەیتوانی مەرامی گلاّوی خۆی جێ بەجێ بکــات و بیرو هەستی نەتەوایەتی لە بیر خەڵك بباتەوە و بیانکات بــە دوژمــنی شۆڕشــی گەلەکــەیان. هــەر بۆیــە رژێــم ئــەمجارە قەڵاچــۆکردن و دابــڕان و راگواســتنی دانیشتوانەکەی بەباشترین چارەسەر زانی. دواجار ناوچەکەی کــرد بــە ناوچــەیەکی چــۆڵ و قەدەغــەکراو. لــە رۆژی (١٩٨٩/٦/٢٦) دەروازەی ناوچــەی پــشدەر لــە بازگەی دەربەندی **کێوەڕەش** داخرا و بوو بە **ناوچەیەکی محرەمە!**.

ئەوەی لێرەدا دەیخەینە روو چمکێکە لە رووداوە مێژووییەکانی ئەم ناوچــەیە، لــە ماوەی نێوان بۆردوومانە خوێناویەکەی ١٩٧٤/٤/٢٤ تا بەرواری راگواستن و راپەڕینە مەزنەکەی بەهاری ساڵی ١٩٩١.

## ڕووداوە تاڵەکانی ساڵانی دوای بۆردومانەکەی ١٩٧٤/٤/٢٤

وەك ئاشکرایە، بۆردومانەکە لە ١٩٧٤/٤/٢٤ ڕوویدا، دوای بۆردومانەکە حەوزی پشدەر بە تایبەتی شاری شیرینی قەڵادزێ، بوو بە وێرانە و چۆڵکرا. زۆربەی دانیشتوانی شارەکە ڕوویان کردە گوندەکانی ناو وڵاتی ئێران. زۆر کەس لە برسان ڕۆیشتن. خەڵك بە بێکار و کاسبی توانای دابین کردنی بژیوی خۆی نەبوو چ بگا ئەم لێشاوەی میوان کە لە شارەکانی تری کوردستانەوە ڕوویان کردبۆ دەڤەری پشدەر و شەوان بەسەر ماڵەکاندا دابەشدەکران. کورد گوتەنی ماڵ خۆی نەبوو میوانیش ڕووی تێکرد.گرفتی دینار و تەمەنیش کێشەیەکی ڕۆژانەی خەڵك بوو. هەرچی قوتابی زانکۆ هەبوو هەموویان بردن بۆ گوندی هەڵشۆ و لە بن دار گوێزەکان دابەشیان کردن و لەوێ دەژیان. ڕژێم گەیشتبۆ شاری ڕانیە و لەوێوە هێرشی دەکرد تا بگاتەوە قەڵادزێ. شەڕی قورس لە شاخی ئاسۆس و کێوەڕەش برپا ببوو. قەڵادزێ کە بەرەی شەڕ بوو چۆڵ کرابوو، تاك وتەرا ماڵی تێدا بەدی دەکرا. مزگەوتەکانی شار کراوە بوون بۆ پێشمەرگەو خەڵکی ئاوارە. و بازاڕ نەبوون دوکانەکان داخرابوون. تەنیا دوو کەبابخانە لە سەر چۆمی قەڵادزێ لە ناو باخچە سپیدارەکانی بەرامبەر مزگەوتی خانەقا دانرابوون. ڕۆژانە فڕۆکەی ڕژێم بەسەر ناوچەکەدا دەسووڕایەوە هەرچی بەدی کردبا بۆردوومانی دەکرد. ڕۆژێك دوو فڕۆکەی مێك هاتن لە گاڕانی سەرەتەپکانیان دا وئاژەڵێکی زۆریان کوشت، ئێمە لەگەڵ چەند گەنجێك چووین ئاژەڵە برینندارەکان سەر ببڕین. دوای (١٠) خولەك فڕۆکەکان هاتنەوەو کەوتنە بۆردومانکردنی ئێمە، خۆشبەختانە بەسەلامەتی ڕزگارمان بوو. لەگەڵ چەند هاو تەمەنێکم بە تەنیشت (گۆڕستانی قەڵادزێ)دا گەڕامەوە ناو شار. ئێمە لە قەڵادزێ مابووینەوە و کەسو کارمان چوو بوون بۆ ئێران. ڕۆژی ١٦/ ١٩٧٤/٨ لە ناکاو دوو فڕۆکەی **سۆخۆی**



هاتن بە ناپاڵم دووبارە بۆردوومانی قەڵادزێیان کردەوە. لە ماوەی چوار مانگدا ئەوە دووهەمجار بوو قەڵادزێ بۆردومان بکرێ. ماڵێکی خەڵکی **بۆسکێن** بە ناوی ماڵی **خاڵە مینە**، لە ترسی ڕژێم ڕایان کردبوو، هاتبوونە ناو خانووە وێرانکراوەکەی **حەسەن سەعید** لە گەڕەکی کارەبا. پێیانوا بوو شوێنێکی ئارامە و جارێکی تر ئەم کاولە خانوە بۆردوومان ناکرێتەوە. خانووەکە دیواری بە پێوە نەمابوو, لەدەشت و دەر دەچوو، بەڵام ناپاڵمێك کەوتە ناویان و بەداخەوە هەموویان شەهید بوون کە ژمارەیان پێنج سەر خێزان بوو. ئەو ڕۆژە و ئێستاش خەڵکی ساویلکە دەڵێن کە دوو کەس تەقەیان لە فڕۆکەکان کردووە بۆیە ئەم شوینەی بۆردومان کرد. خەڵك لە خۆیانەوە ناوی دوو کە سیان دەبرد، بەڵام من وەك شاهییدحاڵێك پێموا نییە کەس تەقەی کرد بێت، چونکە ئەو شوێنەی فڕۆکەکان بۆردومانیان کرد تەنیا (٢٠) بیست مەتر لە ماڵی ئێمەوە دووربوو, من لە ماڵەوە بووم، ئاگاداری ڕووداوەکە بووم. ئەو ڕۆژە شار خامۆش و بێ دەنگ بوو. تاك و تەرا خەڵکی لێمابوو. دەنگی هیچ شتێك نەدەهات. نزمترین دەنگ دەگەیشتە هەرچوارگۆشەی شار. من لەم کاتەدا گوێم لە هیچ تەقەیەك نەبووە، ئەوانەی دژی شۆڕش بوون ئەم بوختانەیان دەکرد, چونکە فڕۆکەکان پێش ئەوەی بگەنە سەرشار بۆمباکانیان فڕێدا. دوور نییە تەنها ئەم بۆردوومانە بۆ ڕووخانی ورەی پێشمەرگە بوبێت. هەرواش بوو، کاریگەری خۆی هەبوو، چونکە ڕۆژی دوای بۆردومانەکە، سوپای ڕژێم گەڕایەوە قەڵادزێ (واتە ١٩٧٤/٨/١٨ قەڵادزێ لە لایەن ڕژێمەوە گیرایەوە). ئەو کاتە قەڵادزێ بەرەی پشتەوەی شەڕبوو. ئەو خەڵکەی چوو بوون بۆ ئێران، بە یەکجاری ئاوارەی ئێران بوون و، قەڵادزێ کەوتەوە دەست ڕژێم. لەم ڕۆژگارەدا زۆر کەس لەشار مابوونەوە و چاوەڕێی هاتنەوەی حکومەتیان دەکرد، بە تایبەتی لایەنگرانی حزبی شیوعی و هەندێك لە ئاغاکان و، هەر بە گەیشتنەوەی ڕژێم چەکیان دژی شۆڕش هەڵگرت.

خەڵکی قەڵادزێ ئەوانەی پەرتەوازەی ئێران ببوون، زۆریان کەوتنە ئۆردوگای **قولتێ** کە ماوەی (١٥پازدە) کم لە ڕۆژهەڵاتی شاری سەردەشتەوە دوور بوو، لەسەر چۆمی کەلوێ کە ئێمە پێی دەڵێن زێی بچووك. ئەم خێوەتگایە (١٧٠٠) ماڵی

ئاوارەی لێبوو. شوێنەکە زۆر ناخۆش بوو. بای لماوی زۆر بوو. تەپو تۆزخەڵکی هەراسان کردبوو. خێوەتگاکە کرابوو بە چەند کەرتێك، واتە چەند بەشێك بۆ دابەشکردنی خۆراك و پێڕاگەیشتنی ئیداری کە لە لایەن ئیدارەی سەردەشتەوە سەرپەرشتی ئەنجام دەدرا. رێکخراوی **شێروخورشید** کەلوپەل و خواردنی دابین دەکرد. قوتابخانە و نەخۆشخانە و شارەوانی لێبوو کە بەحەسیرو خێوەت دروستیان کردبوو. دەهاتیتە ئەو دیوی بازگەی ئۆردوگاکە چەند خێوەتێکی ئیداری لێ بوو. یەکەم خێوەت سەربازی بوو، دوو ئەفسەری لێ بوو ئەفسەری یەکەم (**سەروان رەحیمیان ـ** سێ ئەستێرە) بوو، پیاوێکی زۆر سەنگین و بەڕێز بوو کەس نەیدیبوو پێبکەنێ و هەرگیز بەناو ئۆردوگاکەدا نەدەگەڕا, ئەفسەرەکەی تر، قەڵەوێکی کورتەبنەی یەك ئەستێرە بوو بە ناوی **سەروان تەباری**، پیاوێکی سوعبەتچی و قسە خۆش بوو، ئەو دوئەفسەرانە هەردووکیان فارس بوون. دوای ئەو خێوەتی دووەم بنکەی پیاوێکی سازمانی ساواك بوو، سازمانێکی (واتە ئەمنێکی) پایەبەرز بوو بە ناوی **جەفایی، رۆژانە** لە سەردەشتەوە دەهات بۆ ئۆردوگا. پتر کوڕێکی کوردی ناوچەی سەردەشت بەناوی **حوسێنی حەمەسەلکە** کاری سازمانی بەڕێوەدەبرد. ئەو کوڕەم زۆرباش دەناسی، چونکە لە ساڵانی **١٩٦٩** تا **١٩٧٢** لە قەڵادزێ لە **حەمام سەعید** ناتر بوو وپشتی خەڵکی دەشۆری بوو، دەیگوت لە حکومەتی ئێران قاچاغ بووە. گشت قەڵادزێییەکانی ناو ئۆردووگای دەناسی، کوڕێکی زۆر باش بوو رێزی خەڵکی قەڵادزێی زۆردەگرت و چاوپۆشی لە زۆر کاری نابەجێ دەکرد. ئەم کوڕە دوای شۆڕشی ئێران بوو بە پێشمەرگەی حزبی دیموکراتی ئێران و شەهید بوو، سێیەم خێوەت خێوەتی کاربەدەستێکی خۆمان بوو کە ئەندام بوو لە لیژنەی ناوچەی قەڵادزێ. ئەوسا لیژنەی ناوچەی قەڵادزێ لەگوندی **بێکڵۆ** بوو، ئەم بەرپرسە ناوی **مامۆستا مەلا محەمەد بێکڵۆیی** بوو. پیاوێکی باڵابەرز، تەمەن و تا رادەیەك عەرەبی و فارسی قەواعیدی دەزانی. ئەم پیاوەگەڕیدە و دنیا دیتە بوو. زۆر بەسەرهات و قسەی خۆشی لابوو. لە هەموو روویەکەوە پاك و دلسۆزی بوو، هەموو خەڵك خۆشیاندەویست و



قسەیان قبوڵدەکرد. زۆر شیاو بوو بۆ ئەم بەرپرسیاریەتیە. کە توڕەیان دەکرد عەرەبی و فارسی و کوردی تێکەڵدەکرد. بەرپرسە ئێرانیەکان زۆر شەرمیان لێ دەکرد و لە ترسی ئەو نەیاندەوێرا هیچ کالایەك بەکەمی بنێرن. ئێرانیە کان نەیاندەوێرا دەست لەکارو باری وەردەن. ئێواران بۆ قسەی خۆش دەورەیان دەدا، یا توڕەیان دەکرد بۆ ئەوەی جنێویان پێبدات. زۆرجار لە دەست سەرپێچی گەنجەکان و تێکهەلچوونیان لەگەڵ عەجەمەکان، بێزار دەبوو. رۆژێك زۆر توڕە بووگوتی:

ـ وام لێهاتووە لە داخی ئەم خەڵکەی خۆم بەم زێیە (واتە چۆمی کەلۆێ) دادەم. بەڵکو بخنکێم و لە دەستتان رزگاربم.

ـ **غەفوری مام سمایل** کە پیاوێکی قسەخۆش و ئەکتەری شانۆکانی نەورۆز بوو، لەو کاتەدا پێی گوت: راوەستە مامۆستا ئەم کاغەزەم بۆ بگەیەنە **سندۆلان**. ئینجا مامۆستا پێکەنی و رقەکەی نیشتەوە.

ئەم ئۆردوگایە جگە لەتەپوتۆز، هیچ شوێنێکی لێنەبوو کاتی تێدا بەسەربەرین. بای لماوی ژیانی زۆر ناخۆ شکردبوو. لەناو ئەو خێوەتگایەدا, بەهەرلایەکدا بچویتایە دەرەوە عەجەمەکان دەیانگرتی. سمایلی مام ئەحمەدیش چاخانەیەکی بەحەسیر دروستکردبوو, خۆی چەند توڕەو تەنگاو بوو، واقعی ئۆردوگاش سەد ئەوەندەی تر توڕەی کردبوو، نەتدەوێرا بیدوێنی خێرا دەریدە کردی.

زۆرجار گەنجەکان بە قاچاغی دەڕۆیشتن بۆ سەردەشت و دەگیران، مامۆستا زۆر خۆی هیلاك دەکرد تا بەریدەدان. رۆژێك (١٠) دە کەس لەبەر بێزاری بە قاچاغ چووبوون بۆ ناو شاری سەردەشت. لە گەڕانەوەیاندا زاڵگەکە رێگەی نەدەدان بگەڕێنەوە ناو ئۆردوگا. مامۆستاش بە ناچاری لە جەماعەتی سەیتەرەکە تکای بۆ دەکردن. کاتی بانگی ئێوارە بوو. تازە مانگ هەڵدەهات. **حەمەی ئایشێی** هونەرمەند خوا لێی خۆشبێت، لەگەڵ ئەو دەکەسە بوو. سەری بەزر کردەوە و بەدەنگی بەرز رووی لە مانگ کرد کە بە تاقی ئاسمانەوە بوو، ئەو شیعرەی مامۆستا **فایەق بێکەس** ی شاعیری بە (دەسکاری خۆیەوە) خوێندەوەو گوتی:

**ئەی مانگ من و تۆ هەردووك هاودەردین**

**هەردووك گوێرەکەی یەك مانگای زەردین**

**تۆ خوێڕی و ڕەنگ زەرد بە ئاسمانــــــــەوە**

**منیش تێ هەڵدرا و بە شارانـــــــــەوە**

بوو بە پێکەنین و بۆ عەجەمەکانیان کرد بە فارسی، ئەوانیش زۆر پێکەنین، ئنجا ڕێگەیان پێدان بێنە ژوورەوە.

خەڵك خواردنی زۆر بوو بەڵام پارەیان کەم بوو. کەس ڕێگەی کاسبی کردنی نەبوو. مامۆستا ڕقی لەو کەسە دەبۆوە کە لەگەڵ کاربەدەستێکی ئێرانی ڕاوەستابا, یاخود قسەی لەگەڵ کردبا، یا تەکلیفی ئیشێکی لە عەجەمەکان بکردایە، دڵی لێ پیس دەکردو ڕقی لێ دادەگرت. بە هەوڵی مامۆستا کۆمەڵێك وەستا و کرێکار لە کومپانیانی **هەریسۆن** بۆ کار کردن وەرگیران، ئەم کومپانیایە لە گوندی **ڕەبەت** خانوویان بۆ ئێمە دروست دەکرد، گوایە دەچووین بۆ ئیشکردن بەڵام ڕۆژانە جگە لە شەڕو ئاژاوەو زیان گەیاندن بە کەلوپەلەکانی کۆمپانیا, جنێودان بە شاو دەوڵەتی ئێران، ڕۆژیان بەسەر دەبرد و کەس ئیشی نەدەکرد. زۆر لێمان بێزار بوون بەڵام دیار بوو لە دەسەڵاتیاندا نەبوو دەرمان بکەن. بە ڕاستی ئێمە میوانێکی خراپ بووین بۆ دەوڵەتی ئێران دیاربوو کاری پێمان بوو بۆیە لێیان قبوڵ دەکردین.

ئێوارەیەك مامۆستا سێ کەس لە ئێمەی بانگ کرد بۆ ناو خێوەتەکەی خۆی. کە چووینە لای زۆر قسەی خۆشی بۆ کردین. گوتی ناهێڵم بێکار بن، بەڵام ئێوەش دەبێ شتێك بۆ من بکەن. فەرمووی: ئێوە وەخت و بێ وەخت بەردەوام هاتوچۆ دەکەن، بزانن کێ هاتوچۆی سازمان دەکات بە دزی بە مامی خۆتان بڵێن.

چەند بەیانیەك کرێکارەکان زەلامێکیان بینی بوو کە لە خێوەتی سازمان بە دزی دێتە دەرێ و دەچێتە ناو ماڵەکان، خێرا مامۆستایان ئاگادار کرد.

گوتی: چاکە، دەنگ مەکەن، سازمان ڕێگە نادا پیاوی ئاوا هیچ و پوچ هاتوچۆ بکات، پێیان گوتووم ئەو نامەردە کاری زۆر خراپی کردووە. و گوتی:



فێر بووە ڕێگە بە ژنان دەگرێت کە بۆ ئیشوکار دەچنە سەر ڕووبارەکە. خەریکە ئابڕوومان دەبات. ئێوارە دەورەمان دابوو، بانگی چاودێری کرد، و گوتی: شەخسە، بابەکرە خوار برۆن ئەو (...) بۆ بانگ بکەن چاودێرەکان بە دوایدا چوون و هێنایان.

گوتی: فلان کەس ئێمە لەبەر سێبەری ئەو شاهەنشایە شەریفە حەساوینەوە، دەبینی چۆن شەرەف و ناموسمان دەپارێزێ، چۆن خزمەتتمان دەکات، بەو تۆپە زلانە بۆمان لە دوژمنەکەمان دەدات، جەنابیشت دەچی ڕێگە بە ژنان دەگری، ناموسمان دەبەیت.

کابرا خەریك بوو وەڵام بداتەوە، پاکانە بکات، چونکە شتی وای نەکرد بوو، نەیهێشت وەڵام بداتەوە بە گۆچان کەوتە سەری و خستی، **حوسێن** ی سازمان و **سەروان تەباری** هاتن و خەریك بوون دەستی بگرن، مامۆستا بەرەو ڕوویان چوو...

گوتی: ئەوپەدەر سەگە ڕێگەی بە ژنان گرتووە و خەریکە ئابڕووی دەوڵەتی ئێران بەرێ، حوسێنی سازمان و سەروان تەباری گەڕانەوە ناو خێوەتەکەیان. پێیان شەرم بوو بەرگری لێ بکەن!

گوتی: پەلبەستی بکەن و بینێرنەوە عێراق، نمەك حەرامی وا بۆ دەوڵەتی ئێران نابێت، بەم شێوەیە گرتی و دەریکرد.

لە ڕاستیدا لەوکاتەدا هەندێك کەس دەستیان لەگەڵ سازمان تێکەڵکرد بوو، شۆڕشیش بە ئاشکرا نەیدەتوانی سزایان بدات...

بەرەو پایزێکی درەنگ دەچووین. هەوا ساردی کرد. باران بارین دەستی پێکرد. حاڵی خەڵك لەناو قوڕوقاڵدا زۆر خراپ بوو. خانووەکانی ڕەبەت یش تەواو نەببوون. بەرەبەرە باریان دەکردین بۆ ڕەبەت. مامۆستا: غەریب پشدەری شاعیر، عاسێ بوو با نەدەهات، نوسراوێکی زۆر توندو ڕەقی نووسی بەناوی... **بە نوێنەرایەتی گاڕانی ئۆردوگای قولتێ بۆ لیژنەی سەرپەرشتی ئۆردوگاکان**. ئەم نوسراوە گەیشتە سەرکردایەتی. وابزانم مامۆستا غەریب بانگکرا بۆ لیژنەی سەرپەرشتی. ئەم ئۆردوگایە زیاتر لە (٧٥) حەفتا و پێنج هۆڵ بوو. هەر هۆڵەی (٢٥ یا ٥٠) ژوور بوو. هەندێکی بەخشتی سوور کرابوو هەندێکی تریش بە بلۆك.

قوتابخانەو نەخۆشخانەی چاکیان بۆ دروست کردبووین. تا رادەیەك شوێنمان باش بوو. خواردن و سووتەمەنی زۆر بوو.

رۆژانە بیرمان لەوە دەکردەوە چۆن بگەڕێینەوە بۆ کوردستانی عێراق. و رۆژ و مانگمان دەژمارد پێمانوا بوو لە ماوەیەکی کەمدا شۆڕش سەر دەکەوێ و بە سەربەرزی دەگەڕێینەوە. هەر لەم ماوەیەدا رۆژێك لە **چایخانەی برایماغا** لە ناو بازاڕ دانیشتبووین، لەگەڵ **محەمەدی حەسەنی فەقێ ئەحمەدی** ــ کە ئێستا فەرمانبەری دائیرەی زراعەی هەولێرە، رۆژنامەمان کڕی، باسی فڕۆکەیەکی تێدا بوو، کە لە **موسڵ**ەوە فڕێندراوە بۆ **تاران**. ناوی فڕێندەرەکە لەگەڵ رەسمێکی نووسرابوو **ئەحمەد کوردی**. و نووسیبووی لە فڕۆکەخانەی تاران لەگەڵ پاسەوانەکان کردوویەتی بە شەڕو کوشتوویانە. **محەمەد** رەنگی تێکچوو. گوتی: هەبێ و نەبێ ئەوە ئەحمەدی برامە ئەم کارەی کردووە و کوژراوە. هەستا رۆیی و بە سواری سەیارە لە رێگەی **حاجی ئۆمەران**ەوە گەڕایەوە. من زۆر سەرسام بووم. خەڵکی سیاسی گومانێکی پەیداکردبوو کە پەیوەندی نێوان شۆڕش و ئێران بەرەو باشی ناڕوات. ئێمەی قەڵادزەییش زۆر دڵمان خۆش بوو بە فراندنی ئەم فڕۆکەیە، چونکە بە تۆڵە کردنەوەیەکمان دەزانی لە رژێم و بەلامانەوە سەیر بوو بۆ یەکەمجارکوردێکی قەڵادزەیی بتوانێ فڕۆکە بفڕێنێ.

بە چاوەڕوانی و بە ئومێدی خۆشی رۆژمان بەڕێ دەکرد. رۆژانە خەبەری سەرکەوتنی شۆڕشمان لە بەرەکانی شەڕ پێدەگەیشت. تا **پەیمانی شوومی جەزایرمان** لە رۆژی ٦/٣/ ١٩٧٥ دا بەرگوێ کەوت.

لە بیرمە باوکم دۆش دامابو زۆر غەمباربوو. گوتی ئەمجارەش لەسەر کەوڵی کورد پێکهاتوون. وهیچ حساب بۆ کورد نەکراوە و باسی نەکراوە، ئێمە گاڵتەمان پێکرد و وتمان چۆن شتی وا دەبێت، چۆن ئەم شۆڕشە تێکدەچێت؟ باوکم گوتی خوابکات من هەڵەبم.

خەڵك ترسی لێ نیشت، دەنگوباسی تێکچوونی شۆڕش دەبیسترا، بەڵام کەس باوەڕی نەدەکرد پیلانەکە ئەوەندە گەورە بێت. ئیزاعەی شۆڕش داوای گفتگۆی کرد لەگەڵ حکومەتی عێراق. حکومەتی عێراق لە وەڵامدا گوتی:



ـ ئاڵایەکی سپی هەڵکەن و بێ قەید و شەرت خۆتان تەسلیم بکەن. خەڵکەکە بەو وەڵامەی رژێمی عێراقی پتر ترسی لێ نیشت. خەڵکی بۆ بیستنی هەواڵێکی خۆش شەورۆژ رادیۆیان بە گوێوە بوو. رادیۆکانی بیانی دەیانگوت پێشمەرگە شەری خۆکوژی دەکات.

رۆژی دواتر **سەید** وەسیم رادیۆیەکی کۆنی جۆری **کۆنیۆن** ی پێ بوو. لەبەردەم ستونی کارەبای بەردەمی ماڵی خۆیانیدا وەستا بوو، تا باشتر ئیزگەی شۆڕش وەربگرێت. کۆمەڵێك دەورەمان دابوو هەواڵێکی خۆش بڵاوبکاتەوە، ئیزگەکە کرایەوە، سەرەتا قورئانی خوێند، دواتر بانگەوازی ئەوەی کرد کە بەهۆی کێشەیەکی تکنیکی بۆ ماوەیەك ئیزگەکە دادەخرێت. ئێستاش لە بەرچاومە چۆن سەید وەسیم بە چاپۆك کێشای بەسەری خۆیدا رادیۆکەی فرێدا و رووی لە ئاسمان کرد بە گریانەوەگوتی:

ـ خوایە تۆش دۆستی کورد نیت؟ و دەستیکرد بە گریان. ئێمەش وەك ئەو بەگریانەوە بەرەو ماڵ بووینەوە. هەورێکی رەش باڵی کێشا بەسەر ئەم خەڵکە سەرگەردان و ئاوارە و بێ کەسەدا. لە هەموو ماڵان بوو بە شیوەن و گریان. هەرگیز رۆژی ئاوا رەشم لە ژیانمدا نەبینی بوو، زۆر لە رۆژی بۆردومانەکە ناخۆشتر بوو. پۆل پۆل پێشمەرگە لە بەرەکانی شەڕەوە بە غەمباریەوە گەڕانەوە ئۆردوگاکان بۆ ناو ماڵ و منداڵیان. لە هەموو ماڵان بوو بە گریان و قوڕ پێوان. ژن و منداڵی پێشمەرگە شەهیدەکان بێ خاوەن و بێ سەرپەرشت کەوتنە گۆڕێ. هەر کەسە خەمی خۆی لەبەر بوو. هەرچەندە رژێم لێبوردنی گشتی دەرکرد، بەڵام خەڵك متمانەی پێی نەبوو. هەندێك کەس دەیگوت ئیعدام دەکرێین. یەك دەیگوت دەگیرێی، یەك دەیگوت هیچمان پێ نالێن. من ئەو رۆژە وەك گەنجێکی سەرگەرم دڵ پر لەغەم چووم بۆ حاجی ئۆمەران وچۆمان و لەگەڵ خەڵکێکی زۆر سواری پشتی پیکابێك بووین. ئەو رۆژە وەك رۆژی حەشر بوو. فڕۆکەی عێراقی بە شێوەیەکی ئیفتزازی بەسەر خەڵکەکەدا دەهات و دەچوو. من رۆژی دواتر بە سنووری کێلێ دا لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی هاوتەمەنم بە دۆڵی کانی شیلان دا هاتمەوە قەڵادزێ. بارەگا و تۆپەکانی

شۆڕشم بینی کە پێشمەرگە خۆی تەقاندبوونیەوە. دیمەنێکی زۆر ناخۆش و دڵتەزێن بوو. شەو هاتمەوە قەڵادزێ. ئەوەی دەهاتەوە دەبوایە خۆی بناسێنێ. من لە ڕێگەی حزبی شیوعیەوە خۆم ناساند. ناویان نووسیم و بۆ هیچ شوێنێکیان نەبردم. ئەو کاتە **عەلی کلاشینکۆف** و **حەمە کۆیی** لەوێ بەرپرس بوون. قەڵادزێ شارێکی وێرانە بوو. وەك کۆنە سەربازگە وابوو تەنانەت ئەو ماوەیە کارەباشیان نەبوو. زۆر خەڵك بە سەڵتی لەوێ بوون. ناوشار خەڵکێکی زۆر برسی و ڕەشوڕوتی لێبوو. دیار بوو بە درێژایی ئەمساڵە ژیانیان لە حەشارگە و ژێرزەمیندا بەسەر بردووە. ئەوەی مابۆوە و نەهاتبوو بۆ ئێران گشتی پەشیمان بوون کە نەهاتبوون. خەڵکەکەی لەوێ مابوون بە تانەوە بە ئێمەی گەڕاوەی ئێرانیان دەگوت برنج خۆرەکان هاتنەوە. ئێستا تەنیا یەك ڕۆژ بوو هاتبووینەوە کە بانگەوازیان کرد هەرچی خەڵکی شارە بێت بۆ یاریگای قەڵادزێ. خەڵکی شاریان بە گشتی لە یاریگاکە کۆکردەوە کە ئێستا بازاڕی دۆلارە لە سەروو قوتابخانەی ئامادەیی و هۆڵی **فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە** یە. ئێمەی گەڕاوەی ئێرانیان پێش خۆیاندا و بەرپرسێك دابەزی بە ناوی **غانم عبد الجلیل**، وابزانم ئەندامی بەناو **قیادەی قوتری** بوو. ئەو بەرپرسە لەسەربانی قوتابخانەکەوە قسەی دەکرد. جاش و شیوعیەکان لە دەوری کۆبوونەوە. حەمەی باپیراغای قائیمقام لە تەنیشتی وەستا بوو. زۆر غرورانە قسەی بە شۆڕش و بە بارزانی گوت. کە دەیگوت **جیب العمیل** دەبوو بە چەپڵەڕێزان. بەڵام بە هیچ شێوەیەك باسی **جەبهە** و **حزبی شیوعی** نەدەکرد. وا بزانم شتێك بڕێك پارەشیدا بە وانەی لە قەڵادزێ مابوونەوە. هانی خەڵکی دا و گوتی:

ـ بڕۆن کەسوکارتان بهێننەوە، عەفواتە هەرچیە کیان کردبێ بەخشراون. ئینجا خەڵك بڵاوەی لێ کرد. منیش دیسان بەرەو ئێران ملی ڕێگام گرت و، هاتمەوە ئۆردوگای ڕەبەت. لەوێش کە ڕۆژبۆوە بانگەوازیان کرد وتیان کۆببنەوە و قسەتان بۆ دەکەن. گەورە بەرپرسێکی عێراقی بە ناوی **نەعیم حەداد** لە ئێران سەردانی هەموو ئۆردوگاکانی ئاوارە عێراقیەکانی کردبوو، هات بۆ ڕەبەتیش. داوای لە خەڵك کرد بگەڕێنەوە وڵاتی خۆیان و گوتی:



ـ عەفواتە چیتان کردبێ و چیتان گوتبێ کەس قسەتان پێ ناڵێ.

بەڵام لەم ساتەدا سازمان (واتە ساواك) بەدزیەوە هانی خەڵکی دەدا و بەرد بارانیان کرد، عەجەمەکان بە فارسی بە خەڵکیان دەگوت:

ـ (**سنگ بزن**)، واتە بەردبارانی بکەن.

بەم شێوەیە نەعیم حەدادیان بە پڕتاو بە سەیارەی نەخۆشخانە و بەجلکی ژنانەوە بەڕێکرد. خەڵکیش دەستی کرد بە خۆ ناونووسکردن. یەك دەیگوت من هیچم نەکردووە. یەك دەیگوت من ناوێرم. بەم جۆرە رای جیا جیا هەبوو. دیسان جارێکی تر جاڕیان دا کە کۆببینەوە و قسەمان بۆ دەکەن. خەڵکیان لە قوتابخانەیەکی ڕەبەت کۆکردەوە و، دکتۆر **د. خالید سەعید** ئامیر بەتالیۆن بوو لە هێزی خۆشناوەتی. سەروملی لە پەنجەرەیەکی قوتابخانەکە هێنابۆ دەرەوە و زۆر بە حەماسەتەوە دڵخۆشی خەڵکی دەدایەوە و دەیگوت:

ـ خۆتان ڕاگرن، شۆڕش تێکناچێ، پەیوەندی بارزانی و شا نەپچڕاوە، خۆتان ڕاگرن، مەگەڕێنەوە و چاوەڕێ بن. بەمزوانە هەواڵی خۆش پەیدا دەبێت خەڵك وری روخاو و ڕەشبین بوو. زۆر بە تاسەوە قسەی دەکرد، بەڵام خەڵك هەر بەردەوام بوو لە ناو نووسین. من لەگەڵماڵی باوکم خۆمان نووسی کە بە خەتی پێنجویندا بگەڕێینەوە. چونکە خەتی کێلێ بەفرێکی زۆری لێ بوو نەکرابۆە بۆ ماڵ و منداڵ نەدەبوو. ئەوەی زۆر سەیر بوو ئەوە بوو: ئێرانییەکان پێیان ناخۆش بوو ناوی خۆت بنووسی. دەیان ترساندی دەیانگوت: مەگەڕێنەوە ئیعدام دەکرێن و دەتانکوژن، دەیانگوت **البکر** واتە **ئەحمەد حەسەن بەکر** ئیعدامتان دەکات. بە ئیشارەت دەستیان بەسەر ملیاندا دەهێنا بە مانای ئیعدامکردن. کە خۆمان ناونووس دەکرد سەرۆك جاشێکی ئێرانی، بە ناوی **حەمەی قادر ئاغا** لەولاوە وەستا بوو، دیار بوو پێی ناخۆش بوو ئەم وەزعە بەسەر شۆڕش هاتووە، بە غەمباریەوە بە دزی عەجەمەکان بەباوکمی گوت: ئاغا بڕۆنەوە مەملەکەتی خۆتان، لەوێ ئیعدام بکرێن باشترە نەك لێرە بن.

ڕووداوەکان بە شێوەیەکی سەیر گۆڕان. بە شێوەیەك پێش تێکچوونی شۆڕش یەك عەجەم نەیدەوێرا بێتە ناو قەڵادزەییەکان. بەڵام لەگەڵ تێکچوونی شۆڕش بە ئاشکرا تەعدایان دەکرد، کەچی پێشیان خۆشنەبوو بگەڕێینەوە، دیار بوو دەیانویست بمێنینەوە و سەودایەکی ترمان پێ بکەن.

هەرچۆنێك بێ خۆمان ناونووسکرد و، لەگەڵ چەند ماڵێك بە سەیارەی زیلی عەسکەری وەك ئاژەڵ باریان کردین. زۆر بە بێ ویژدانی ماڵ ومنداڵەکەیان کردین بە سەرباری لۆری و بە ڕێگەی پێنجویندا گەڕاینە وە. بەرەو مەریوان بە ناو شاری سەقز و بانەدا تێپەڕین. لە سەقز سەیارەکەمان ڕاگرت شت بکڕین. باوکم هەندێك میوەی لە پیاوێکی بە تەمەن کڕی. پیاوەکە پارەی لە باوکم وەرنەگرت و دەستی کرد بەگریان. هەرچیمان دەکرد پارەیان لی وەرنەدەگرتین. پۆل پۆل خەڵك وەستا بوو سەیریان دەکردین و بۆمان دەگریان. کە لە سەر سنوور فڕێیان داین، زۆر بەزەییمان بە خۆمان داهات. لەسەر ڕووبارێکی بچووك پردێك دیار بوو گوتیان ئەوبەری پردەکە عێراقە. ماڵەکانمان بە هاوکاری یەکتری داگرت. ئەو کاتە ماڵی **حەمە عەبدولی قەڵادزەیی** و ماڵی **(م. ب)** لەگەڵ ئێمەدا بوون. (م. ب) کابرایە کۆیی بوو لەگەڵ ئێمە بوو. زیاتر لە (١٠) دە تەکەنە ڕۆنی سەربەستراوی لەگەڵ ماڵەکەی (م.ب)دا هێنابوو. هەمووی بەلوعەی زەرد بوو. کە دامانگرت، حەمەی عەبدول دەستی کرد بە جنێودان بە (م. ب) و بۆی چوو لێی بدات و دەیگوت:

ـ ئەو شۆڕشە دزی وەك تۆی لەگەڵە بوو، بۆیە تێکچوو. ساڵێکە دزی دەکەی بۆخۆت بەلوعەکانت لێ دەکردەوە و خەڵکت بە دز دەردێنا!

ڕاستی دەکرد (م. ب) لە دائیرەی ئاو بوو. ئوردوگای ڕەبەت چەند حەوزێکی بۆ ئیشوکاری ژنان لێ بوو. بەیانیان دەیکرد بە هاتوهاوار کە ئەوەندە بەلوعەیە دزراوە، دە چوو لە **شێر** و **خورشید** وەریدەگرتەوە. زەلامێکی دەنگ گەورە بوو. شەرمت لە سەرو کەللەی دەکرد ئەوەش کارو پیشەی بوو. خۆی دزیەکەی دەکرد و دەیخستە ئەستۆی خەڵکە هەژار و لێقەوماوەکەی ئۆردوگا. دیارە ڕەچەڵەك و سەرو کەللە و بە ژن وباڵا لە ناو کوردا حسابی بۆ دەکرێت. حسابیان بۆ حەمەی



عەبدول نەدەکرد دەیانگوت ئارەقخۆرە و، وجەنابی (م. ب)ش ڕێزی لێدەگیرا و لای بەرپرسان قسەی دەڕۆیشت. بەمجۆرە لە ڕێگای **بناوە سووتەی** سەر سنووری پێنجوین، لەسەر حسابی خۆمان سەیارەمان گرت و هاتین بۆ سلێمانی. بۆ سبەی بەیانی گەیشتینە قەڵادزێ. بەڵام کەس لێی نەپرسین لە کوێ بوون؟!، قەڵادزێ پڕ لە جاش بوو. شیوعییەکان چەکدار بوون، ڕێزیان دەگرتین و بە خێرهاتنەوەیان دەکردین. هەندێك جاش بەخێرهاتنەوەیان دەکردین و هەندێك دەیان بوغزاندین و مۆڕەیان لێدەکردین، بەڵام کەس نەیدەوێرا قسەمان پێ بڵێ، دیار بوو ڕژێم ئاگاداری کردبوون. هەرئەو جاشانە دوای تێکچوونی شۆڕش تاوەکو چەك کران چەند کەسیان بە دزیەوە شەوکوت کرد و کوشت.

قەڵادزێ شارێکی کاول و وێرانە بوو، خەڵکێکی برسی و ڕەش و ڕووت، لە سەربازگەی بۆردومانکراو دەچوو. تێکڕا (٢٠) بیست دوکان نەما بوو دەڕابەی پێوەبێ. زۆربەی ئەو خانووانەی سەریان دار بوو، خەڵکەکە لەبەر بێ سووتەمەنی بۆ سووتان ڕووخاندبوویانن.

کاسبییەك کە بۆ خەڵکی نەفس نزم پەیدا ببوو، ئەوە بوو چەك کۆ بکەنەوە و بە پارە تەسلیم بە ڕژێمی بکە. کونەشاخ و ئەشکەوت نەما نەگەڕێن. هەرچی کۆنە چەك هەبوو کۆیان کردەوە و بە (٥٠) پەنجا دینار تەسلیم بە ڕژێمیان کردەوە. ڕۆژێك لەبەر بانقی قەڵادزێ وەستا بووین، پیاوێکی ناسراوی پشدەر ـ ناوی... ـــ لە وکۆڵانەی ماڵی **دێوانەی دێگە** و ماڵی **حاجی مەلامین** دەرکەوت گوێدرێژێکی وەپێش خۆیدا بوو. دوو باقە چەکی کۆن و نوێی بە گوێدرێژەکەوە هەڵبەستبوو. دیار بوو گوێدرێژەکە سەیارەو شاری نەدیبوو ڕێگای دانەدەگرت و هەر ئەوبەرو ئەوبەری دەکرد، کابراش لە گوێدرێژەکەی دەسرەواند و سەلامی بە هەردوو دەستی لە خەڵك دەکرد. زۆر دڵخۆش دیار بوو وەك ئەوەی ئەو شۆڕشی ڕوخاندبێ. **عەلی ڕەسو چاوشین** ی جرتێکی توندی بۆ کێشا و کابراش هەڵوەستەیەکی کرد و مۆڕەیەکی لە خەڵکەکە کرد. ئێمەش خێرا لە وێ ڕۆیشتین نەکا ئیخباریمان بکات.

زۆر جار گوێ لێبووە دەیانگوت دەبوو شۆڕش تێکنەچووبا و شەڕی پارتیزانی بکردایە. بۆیە ئەم باسە لێرەدا دەخەمە روو، رۆژێك لەبەردەم بینایەی ئێستای **مجمع دوائیر** زیاتر لە (٢٠) بیست جاش کۆببونەوەو دیار بوو بە نیازی شتێك بوون. زۆر مەراقم بوو بزانم چیەو، بۆکوێ دەچن!. جاشێکم دەناسی لێم پرسی چییە؟ گوتی:

ـ دە پانزدە کەس لە شاخی **کوڕیس** ماوون بە نیاز نین خۆیان تەسلیم بکەن، گوتی هێز کۆ دەکەینەوە دەچین پەتیان دەکەین و دەیانگرین!.

لەوئان و ساتەدا بەو بارودۆخەی هاتبۆ ئاراوە، من بەش بە حاڵی خۆم پێموانەبوو کورد بتوانێ شۆڕشی پارتیزانی بکات.

وردە وردە چەك تەسلیمکردن کەم دەبۆوە، رژێم نرخی چەکی گران کرد، بۆ هەر پارچە چەکێك (١٠٠) سەد دینار، جا هەر جۆرێك با. کە زانی چەك نەماوە جاشەکانی کۆکردەوە و بە ناوی چەك گۆڕین چەکەکەی لێ کردنەوە، بی ئەوەی هیچ حسابیان بۆ بکات، بەرەڵلای کردن.

ئەوەی مابوو بارەگاکانی حزبی شیوعی بوو، هەرچەندە چەکدار بوون بەڵام زۆر بێ دەسەڵات بوون. هەموو حزبی شیوعی قەڵادزێ دەسەڵاتی یەك پۆلیسی عارەبیان نەبوو. شیوعیەکان سەری قسەو بنی قسەیان **جەبهە وەتەنی** بوو. ئەوەش ئەو جەبهەیە بوو بە بێ دەسەڵاتی لەگەڵ حکومەت کرد بوویان.

حکومەت زیاتر رێزی لەو خەڵکە دەگرت کە لە ئێران گەڕا بۆوە نەك ئەوانەی لەگەڵ رژێم بوون. ناوی خەڵکی گەڕاوەیان نا **عائدون**. لە راستیدا شیوعیەکان ئامۆژگاری خەڵکی گەڕاوەیان دەکرد و دەیانگوت:

ـ عەیبە مەترسن، خۆتان راگرن کەس ناتوانێ قسەتان پێ بڵێ. مەبنە **ئەمن و بەعسی و ئیستخبارات**. ئەمەش لەبەر ئەوە بوو، هەندێك خەڵکی رووخاو کەس لە ترسان خۆیان هاویشتبۆ باوەشی رژێم. دەبوون بە پیاوی ئەمن و منزەمە و ئیستیخبارات. رۆژێك ، رۆژی ٧ نیسانی ١٩٧٦ خەڵکی قەڵادزێیان کۆکردەوە رێپێوانیان پێکردین. ئەمنێك میکرۆفۆنێکی بچووکی پێ بوو هوتافی دەکێشا و



خەڵکیش دەیسێتاندەوە. هاتینە خوار بۆ ناو بازاڕ. ئەو کاتە **قادری مەولود قاچ** کە کادیرێکی حزبی شیوعی بوو ئێستا فەرمانبەری نەخۆشخانەی قەڵادزێیە، هوتافی داو گوتی:

ـ (م.م.جەبهە).

کۆمەڵێك ستاندیانەوە و ووتیان (جبهة وطنية). هەرچەندە هیچ دروشمێکی دژی رژێم نەگوت، تەنیا ناوی جەبهەی هێنا. ئەمنەکان وەك هەڵۆ پەلاماریان دا نەیانهێشت دووبارەی بکاتەوە و راپێچیان داو بردیان..

رژێم ئیهانە و ئیفتزازی شوعییەکانی دەکرد. کەچی ئەوان ناوی جەبهەیان دەهێنا و شانازیان دەکرد کە جەبهەیان لەگەڵ ئەم رژێمە بەستووە. دواتر رژێم بە زۆر ناچاری کردن بڕۆن بۆ شاخ و چەك هەڵگرن. بە زۆری دەریکردن، وایلێهات لە هەموو حزبەکانی تر قاچاغتر بوون.

لەو قۆناغەدا، رژێم رووخاوی و بێ ئومێدی ئەو خەڵکەی نە قۆستەوە تا سوودییان لێ وەرگرێ. کاتێك کە ئەم خەڵکە تووشی ئەم رەشبینیە ببوو دەبوایە دەستبە سەیان دابێنی و خەڵك بە کارو کاسبییەوە مەشغول بکات تا بیر لە شۆڕش و یاخی بوون نەکەنەوە. کەچی بە پێچەوانەوە زۆر بە شێوەیەکی دڕندانە رەفتاری لەگەڵدا دەکردن، زەبروزەنگ خەڵکی تۆقاندبوو، بگرەو بکوژە، **کەرتکە** و **زاڵبە**، سیاسەتی رژێم بوو. خەڵك تەواو بێزار بوو. زۆر کەس هەبوو دژی شۆڕش بوو تاکو شۆڕش تێکچوو، هەر لە سجنی **رایات** و**خەلان** سجن بوو یا خود جاش بوو، کەچی خۆم گوێم لێ بوو ئاواتییان دەخواست دەیانگوت: بریا هەر سجن بام نەك ئەم رۆژەم دیبا. چونکە رۆژانە دەیبینی کۆمەڵێك لۆتی و بەرەڵلای ئەو جنووبە ئەمن و ئیستیخبارات بوون و وەك سەگ بەربوونە گیانی خەڵك. سووکایەتی پێکردن، گرتن و شکاندنی خەڵك لە شوێنە گشتییەکان کاری بەردەوامیان بوو. خەڵکیان دەکرد بە سیخور لەسەر یەکتر و دەوری ناموسی خەڵکیان دەدا. سیاسەتی دڵ پیسیان پیادە دەکرد. خەڵکیان لە یەکتری بەدبین دەکرد تا متمانە بە یەکتری نەکەن. مامۆستا

(ك..)گوتی چووم لە دائیرەی ئەمن مۆڵەتی رەسامی باوکم تازە بکەمەوە. ئەوسا مۆڵەتی رەسامی دەبوایە دائیرەی ئەمن بیدات. گوتی دانیشتم و: فلا ن(...)کەس هات مدیری ئەمن ملازم ئەحمەد فەرموی لە کابرا کرد دابنیشیٚ. پێی گوت قسە بکە شەرم مەکە مامۆستاش لەگەڵ خۆمانە. لە خۆیەوە منی لای ئەو کابرایە کرد بە ئەمن. گوتی ئێستا هەزار سوێند بخۆم ئەوکابرایە باوەڕم پیٚ ناکات و هەر بەئەمنم دەزانیٚ. خەڵك زۆر بیٚ دەسەڵات و زەلیل بوو. رەنگە لە قالبی نووسین و گێڕانەوەشدا باسکردنی ئەستەم بێت. پیاوانی رژێم شەو و رۆژ بە کۆڵانی شارو گوندەکاندا دەسوڕانەوە. منداڵێك دەیتوانی دە ستیان لیٚ بوەشێنیٚ، بەڵام شوێن نەمابوو خۆتی لیٚ داڵدە بدەی و ئەم بیٚ دەسەڵاتیە قبوڵ نەکەی. چەند گەنج دوای تێکچونی شۆڕشی ئەیلول لە بەر بێزاری چوون بۆ ئێران و دەوڵەتی ئێرانیش بە پەلبەستراوی رادەستی رژێمی کردنەوە. بەندێکی پەیمانی نێوان ئێران و ئیراق ئەوەبوو نەیارانیان رادەستی یەکتری بکەنەوە. رژێم زیاتر زەفەری بە خەڵکی لادێکان دەبرد. بە هۆی سادەیی و ساکارییان دەیانکردن بە سیخوڕ بەسەر یەکتریەوە. پارە و سەرانەیان لە خەڵك وەردەگرت. ئەمانە و زۆر رەفتاری تری ناشایستە، گەنجەکانی شاری رۆژ بەرۆژ بێزارتر دەکرد. بەڵام نەماندەزانی چی بکەین. لە ترسی پیاوانی رژێم نەکو بێن و بە بەرچاوی خەڵکەوە بتشکێنن، نەتدەوێرا لەهیچ شونێك دابنیشی. دەیان جار لە ترسی پیاوانی رژێم چایخانە و شوێنە گشتییەکانمان بەجێدەهێشت. رۆژێکیان **وریای حاجی ئەحمەد** و **عەلی رەسو حەمدۆك** جیایان کردمەوە وتیان نامانەویٚ چیتر لەو ئەمنانە قبوڵ بکەین. چەند گەنجین یەکترمان گرتووە، تۆشمان وەك برادەر داناوە دەبیٚ ئەگەر بەگژمان داهاتن لەسەر یەك بکەینەوە. من زۆرم پیٚ خۆشبوو، چونکە وریام دەناسی کوڕێکی ئازا بوو، باوەڕم پێی بوو.

لێرەدا هەقە لە گێڕانەوەی ئەو بیرەوەریانە ناوی هەندێك لەو پیاوانەی رژێم بێنم کە چیبوون و بزانین چۆن رۆیشتن، بۆ نموونە:



کابرایەکی سەر بە دەزگای ئیستیخباراتی لیٚ بوو بەناوی **فەهد**. بالاٚ مامناوەندی بوو. جلی کوردی خاکی لەگەڵ جامانە لەبەر دەکرد. چەنەگە شکاوێکی نابووت بوو گوایە پێشمەرگە لە شۆڕشی ئەیلول لە هەڵەبجە لیٚ یانداوە و چەنەگەیان شکاندووە. نازانم راست بوو یان نا، بەڵام تا بڵێی خراپ بوو. شەو و رۆژ لەگوندو شارەکان دەسوڕایەوە. دەوری بیٚ ناموسی هەبوو، وازی لە خەڵك نەدەهێنا تا دەیکردن بە سیخوڕ. سەرانەی لە خەڵك دەستاند. هەر لەخۆوە دەیگرتی. خوا کردی، نازانم چۆن بوو خەڵك زانیان خەڵکی چ ناحیەکی جنووبە. زانیان لە خێزانێکی زۆر سووك و بەرەڵایە. سایەق و سەربازی کورد بە ماڵیان فێر بوون. ئیتر بۆ ئەتك کردنیش با، دەچوونە زگ ماڵیان و دەهاتنەوە بۆ خەڵکیان دەگێڕایەوە. فەهد بیستیەوە زانی خەڵك ناسیوویانە سووکە ئیتر شۆڕ شۆڕ بوو، تا گەیشتە ئەوەی لە نادی قەڵادزیٚ لە دانیشتنێکدا لە نێوان گاڵتە و راستی دا، بە **نوری** ـ نائب زابتی ئیستیخباراتیان گوتبوو، نوری زۆر پێی تێکچوو بوو. نوری تۆزێك تەمەنی هەبوو ئەهلی مەشروب و نادی بوو، خوا هەڵناگریٚ دەوری بیٚ ناموسی نەبوو. بەڵام هەر کەسێك لە ئیستیخبارات ئەشکەنجە درابا نوری ئەشکەنجەی دەدا. پیاوێکی وەرزشکار و باڵابەرزی کەتەی رەشە بوو، خەڵکی موسڵ بوو. کە باسی فەهدی بۆ دەکەن، زۆری پیٚ ناخۆش دەبیٚ، لە نادی خۆی بۆ سەرخۆش دەکا، دەچێتەوە ئیستیخبارات و بانگی فەهدی دەکا و دوای سووك و ریسواکردنی بیرازێکی باشی دەکات. پێی دەڵیٚ: تۆ ئلبڕووی ئێمەت بردووە، هەرچی سەرسەری ولۆتی ئەم شارە هەیە بە خێزانی ئێوە فێربووە. لە ماڵیٚ ئێوە دەمێننەوە. ئێتر لەو رۆژە بەدواوە فەهدمان نەبینیەوە و ئیستیخبارات نەقڵی کرد.

ئەمنێکی تری لیٚ بوو ناوی **زەید** بوو، ئەمنەکان پێیان دەگوت **محمد حلو**. کوڕێکی زۆر جوان و خرپنە بوو. تازە پێدەگەیشت. دائیرەی ئەمن وەك سەگ لەناو شار بەرەڵڵای کرد بوو. دەمانچەیەکی تەکساسی بە کەلەکەیەوە دەبەست. کەم رۆژ هەبوو لە ناو بازاڕ، شت بە خەڵك نەکریٚ، سوکایەتی بە خەڵك نەکا و یەك دوو کەس نەگریٚ. فێری نادی و مەشروب خواردن و ئەولاو ئەولا بوو. دەیانگوت بەسەرخۆشی بە تەڵەوە بووە! دائیرەی ئەمن زانی و ئوەیشیان نەقڵ کرد.

ئەمنێکی تری لێ بوو بەناوی **محمد جبوری**. کوڕێکی باریکەڵەی کورتەباڵا بوو. تۆزێك دەلەنگی. زۆر بێ ناموس بوو. لە خۆوە گێچەڵی بە خەڵك دەکرد. شەو و ڕۆژ بە کۆڵانی شاردا دەسوڕایەوە. ڕۆژێك من خەریکی خانوو دروستکردن بووم. چیمەنتۆم لەسەر جادە گرتبۆوە زۆر هیلاك بووم. لە خۆویەوە هات و گێچەڵی پێکردم .گوتی پیست کردووم. بوو بەدەمەقاڵێمان، دەستی بۆ دەمانچە برد، منیش لە ترسی ئەوەی نەمکوژێ بە هەموو هێزی خۆم خۆم پێی دادا. ئێستاش نازانم چۆن دەمانچەکەی کەوتە ناو دەستم. ئەو بە ڕاکردن بەرەو دائیرە و منیش بە دەمانچە بەستەوە سەرم سوڕمابوو. زۆر ترسام و نەمدەزانی چیبکەم. چ لەو دەمانچەیە بکەم. لەو کاتەدا **خدری حەمەی مەولان** کە ئێستا ماوە و لە مەڵبەندی ٢٤ یەکیەتییە، بەوێدا هات. خوا کاری ڕاست بێنێ گوتی: چییە؟ بۆ ئاوا پەشۆکاوی؟ کە ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە، گوتە مەترسە بڕۆ ماڵی **مەلا عوسمانی موختار**. بڵێ خۆی دەمانچەکەی فڕێداوە منیش شاهیدیت بۆ دەدەم... بێ دەرگا لێدان  خۆم بە ماڵی موختاردا کرد،. کە چوومە ناو حەوشەکەیان، مەلا عوسمان لە حەوشە دەستنوێژی هەڵدەگرت، گوتی:

ـ هەتیو چیت دەوێ؟ کێت کوشتوە؟

وا پەشۆکا بووم چاك لێم حاڵی نەدەبوو، پاکانەم کرد و گوتم:

ـ تەعەدای کردووە و خۆی دەمانچەی فڕێداوە.

ـ مەلا عوسمان: گوتی هەتیوە بۆ لەهێ خۆ ناکەون، بۆ وادەکەن چما شۆڕشی مەلا مستەفای لە گۆڕێ ماوە تا حکومەت دەستی نەتگاتێ. ئەمڕۆ ڕۆژێکە کەڵ بە موو بەندە. ئەو ڕۆژە ڕۆیی، بەسە دامەزرێن!

چوو خۆی گۆڕی، بەختی خۆم ئەو ڕۆژە **بابەکراغای وەزیر** هاتبوو. بردمی بۆ لای ئەو. **ڕەفیق پشدەریشی** لەگەڵ بوو، خواکردی بە هۆی ئەوانەوە ڕزگارم بوو. ئەمنەکەشیان نەقلکرد.

ئەمە کەمێك لە ناوبانگ و کرداری ئەم پیاوانەی ڕژێم بوو. ئەوانەی هاتبوونە ناوچەی پشدەر هەموویان لەم جۆرە کەسانە بوون.



ئەوسا من وەستای گەچکاری وکاشی بووم ئیشم دەکرد. جار جارە ئێواران دەهاتمە لای دوکانی (مەحمودی مامە لاوە). دوکانەکەی سێ کۆڵەگەی لە ناو دوکانەکەدا زۆر وێران بوو، کەمێك شتومەکی فرۆشتنی تێدا بوو. سەرەڕای ئەوش لای ئەومان زۆر پێ خۆشبوو. زۆر دڵخۆشی دەداینەوەو دەیگوت:

ـ خۆتان ڕاگرن شۆڕش ماوەو لە جاران بەهێزترە. دەڵێن **درۆی گەورە ئەوەیە نیوەی ڕاست بێت**. درۆکانی مەحمودیش زۆر گەورە دڵخۆشکەرە بوون، زۆر جاران باوەڕمان پێ دەکرد و دڵمان خۆش دەبوو. وەستا بوو، هەریەکەی بە درۆیەك و بە فشەیەك هەڵیدەخەڵەتاند. چەند کەسێکی قەناعەت پێ کرد بوو ئیشیان بۆ دەکرد، هەڕەشەی پێ لەو لەکەسانە دەکرد کەوا ببوونە پیاوی ڕژێم. **سۆفی عەوڵلاێ ئاڵانی** دەنارده سەریان، سۆفی چەکێکی سەردەمی شۆڕشی ئەیلولی شاردبۆوە و شەوانە بەو چەکە تەقەی لێ دەکردن.

ڕۆژێکیان سۆفی عەبدوڵلاێ فریو دابوو گوتبووی:

ـ ئیزگەکەی شۆڕش کراوەتەوە لە کاتژمێر ئەوندەو لە سەر فلاڵن شەپۆل. سۆفی عەولاێ دەچێتە ماڵەو شەوێ زۆر دەگەڕێ ئیزگەکە نادۆزێتەوە. مەحمود دوو سێ ڕۆژ بەم شێوەیە سۆفی فریو دەدات. تا وای لێدێ سۆفی وەڕەز دەبێ ،ڕادیۆکەی بە دیواردا دەکێشی و دەشکێنێ. دێتە قەڵادزێ دەڵێ:

ـ مەحمود ئەم شەو لای تۆ دەمێنمەوە با گوێم لە دەنگی ئیزگەکە بێت.

ـ مەحمود دەڵێ: درۆم کردووە ئیزگەکە نەکراوەتەوە. ناچار مەحمود ڕادیۆکە بۆ سۆفی دەبژێرێ.

خەڵك ئەوەندە تینووی کوردایەتی بوو بە دوای یەك وشە دەکەوت کە باسی کورد بکات.

لە مانگی ١٠ ی **١٩٧٥ حەمەی مەلا شەریفی** مەنگوڕ، لە سەر کێشەی زەوی جووتیارێکی کوشت و لە حکومەت یاخی بوو. لە گوندەکانی بناری قەندیل

به بێ منەتی دەسوڕایەوە و دژایـەتی ڕژێمـی دەکـرد. دوای تێکـچوونی شۆڕشـی ئەیلول ئەمە یەکەم یاخی بوون بوو لە کوردستان. لە ڕاستیدا لـە سـەر پرسـێکی سیاسی نەتەوایەتی یاخی نەببوو، بەڵام سوودی زۆری هەبوو. چونکە پەنایـەك بـۆ خەڵکی یاخی بوو لە ڕژێـم پەیـدا بـوو. خـەڵك دڵـی زۆر پێـی خۆشـبوو، گـشت کوردستان بەم یاخی بوونەی زانی و، بوو بە وێردی سەر زاری خـەڵك. لـە پـشدەر ناویـان لێنـا **کوێخـا رینگـۆ**. ئیزگـەی BBC لەنـدەن باسـی کـردو بـە (زعـیم المتمردین) ناوی برد. بە یاخی بوونی حەمەی مەلا شەریف پیاوانی ڕژێـم ترسـیان لێنیـشت. وەك جـاران نەیانـدەوێرا، لـە ناوەختـدا لـە مۆڵگـە و شـارەکان دوور بکەونەوە. ئەم کارە جارێکی تر سەلماندی چـیاکانی کوردسـتان پـشت وپـەنان بـۆ خەڵکی شۆڕشگێڕ و لە خۆ بردوو.

# سەرهەڵدانی ڕێکخستنەکانی هێزە سیاسیەکان و مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕش لە ناوچەی پشدەر

ئەوەندەی من ئاگادار بم سەرەتای بەهاری ١٩٧٦ دوو ڕێکخراوی سیاسی لە ناو شاری قەڵادزێ سەریانهەڵدا. یەکێکیان بە ناوی **بزووتنەوەی سۆشیالیستی،** دووەمیان بە ناوی: **قیادە موەقەت** واتە سەرکردایەتی کاتی پارتی دیموکراتی کوردستان. لە ماوەیەکی کەمدا خەلکێکی زۆر پەیوەندی بەم دوو ڕێکخراوەیەوە کرد. لە ناو شار جموجۆڵی سیاسی ریکخرا و نارێکخراو دەستیپێکرد. دوو حزبی جیا لەیەکتری هەر لە سەرەتاوە لێك ئاشکرا ببوون و یەکتریان دەناسی. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك **یەکەمیان** بێ ئەزموونی لە ئیشکردنی ناو شار **دووهەمیان** بچوکی شارەکە و بوونی پەیوەندی دۆستایەتی و خزمایەتی. لەکاتی ئەنجامدانی کاری ڕێکخستن و چالاکی شەوانە تووشی یە کتر دەبوون هەندێك لەو برادەرانە خۆیان دەردەخست تا خەڵك بیانناسن. تەنانەت خەڵکی سادەش دەیناسین، بە تایبەتی خەڵکی گوندەکان, چونکە لە کاتی هاتووچۆکردنیان بۆ ناو پێشمەرگە خۆیان لە خەڵك نەدەشاردەوە. شەوێك ئیشم بە **خدری حەسەنی فەقێ عەزیز** بوو، کە چوم بۆ لای بینیم زیاتر لە ٨ کەس بوون خەریکی کۆبوونەوە بوون. زۆر بێ منەت و بی باك بوون. بە خدرم ووت: ئەم کارەی ئێوە راست نیە، ئاوا نابێت. گوتم خدر لێتان دەقەومێ بە پێلاو لە پێکردن راناگەن. خدر جرتێکی بۆ کێشام گوتی ێێوە هەروا ترسنۆکن. براکانی خدر ماون و شاهیدی ئەم قسەی منن.

شەوێکی تر لای مزگەوتی جوتکانیان توشی حوسێنی رەسواغا و خدری رەسو شەم لۆر بووم. لێیان پرسیم خەریکی چی؟ وا خۆم نیشاندا کەمەوعیدی خۆشەویستیم



هەیە م هەیە. جنیۆیکیان پێدام. خدر دەستی گرتم و خستیە سەر دەمانچەی بن پشتێنەکەی. گوتی ئێمەش وەك تۆ ئاشقین!

ئەوسا شوێنی دانیشتنی جەماعەتی بزوتنەوە زیاتر چایخانەی مەحمود دەبان بوو. حەمەی ئالّی و قوبادی حەمە سا لّح، ئەم چاخانەیان بەکرێ وەرگرتبوو، بەناو چایخانە بوو بۆ کاسبی، بەڵام پتر بۆ بوو لەو چاخانەیەدا یەکتر ببینن و، کاری حزبیان تێدا بکەن. تازە گۆرانیەکی محەمەدی ماملێ بڵاوببۆوە بەناوی، زەمانە گولێکی دامێ بۆنم پێوە نەکرد لێی هەڵوەراندم. گوایە بۆ شۆڕشی ئەیلولی گوتوە. شەو و رۆژ تەنیا ئەو گۆرانیە لێدەدرا. رۆژێکیان **حوسێنی سمایلی مامەحمە،** لەگەڵ چەند برادەرێك لە چایخانەکە دانیشتبوون، بە دەنگەخۆشەکەی بە چاوی پڕ لە فرمێسك ئەم گۆرانیەی دەگوت، برادەرانیش بە کۆرس لەگەڵیان دەگوتەوە، بەدەست خۆت نەبوو غووربەتیت هەڵدەستا. بۆ ئەوانەی قیادەیان خۆشدەویست تەنها دووکانی مەحمودی مامە لاوە بوو، ئەویش ئەگەر رێگەی دابا جار جار بچینە لای. دووکانەکەشی لە هەموو دوکانەکانی قەڵادزێ نابووتتر و وێرانتر بوو. بەڵام ئەوەندە لای ئەم خەڵکە خۆش بوو مەگەر دەریکردباین ئەگینا نەدەرۆیشتین. لە گەورەترین فەرمانبەر و رۆشنبیرو دەوڵەمەندەوە تا هەژارترین کەس رووی تێدەکرد. شوتی دەفرۆشت جارجارە شوتیەکی شکاوی بۆ قاش دەکردین. جارێك ئەفسەرێکی ئیستخبارات بە بەکری سەعیدە پیرەی گوتبوو دیارەتۆش قیادەی بۆیە میوە لە مەحمودی مامەلاوە دەکرِی. بەکر نەیوێرا جارێکی تر میوە لە مەحمود بکرِێ. جارێك رەسوی نادری هونەرمەند هات پێی سەیر بوو ئەم خەڵکە بۆ وا لەو کاولە دووکانە کۆبوونەتەوە. گوتی بچمەوە ئێرانێ نەوارێك لەسەر ئەم دووکانەی پڕ دەکەمەوە. رەسولاوە هەرەشەی لێکردو گوتی دەتکوژم.

مەحمود قسەکانی ئەوەندە ئومێد بەخش بوون، واتدەزانی لەگەرمەی شۆڕشی ئەیلول دای. سەرِرەی ئەوەی ئەمین و جێی متمانە پێکردن بوو، وەسیلەی ئیقناعی بەهێز بوو. کەم کەس هەبوو مەحمود داوای ئیشکردنی لێبکات قەناعەتی پێنەکات. ڕێکخستنی بزوتنەوە باوەڕیان بەترۆر هەبوو، بەڵام ڕێکخستنی قیادە بە

پێچەوانەوە باوەڕیان پێنەبوو. زۆر جار برادەرانی قیادە کە دەیانزانی جەماعەتی بزوتنەوە بەنیازی کوشتنی کەسێکن ڕێگریان لێدەکردن و نەیاندەهێشت. بەڵام دژایەتی یەکترمان نەدەکرد.

ئەو بێ منەتییە و کەمتەرخەمییە خراپ بەسەر ئەم دوو ڕێکخراوەدا شکایەوە و، بوو بەهۆی ئەوەی لە ڕێگەی یەك پێشمەرگە کە خۆی تەسلیم بە ڕژێم کردبۆوە، هەردووکیان بۆ ئیستیخبارات ئاشکرا بن و زۆربەی ئەندامەکانیان بگیرێن. لە ڕۆژی ۱۹۷۷/۱۲/۲ زۆربەیان گیران و لە ڕۆژی ٤ /١٩٧٨/٤ ئەوانەی ئیعترافیان کرد هەموویان بە یەك ڕۆژ لە موسڵ لە سێدارەدران.

**ئەوانە چۆن ئاشکرابوون:**

حەمە عارەب پێشمەرگەی شاخ بوو، خۆی تەسلیم بە ئیستیخبارات کرد بۆوە. ناوبراو **ئەحمەد عەبدولا ئیسماعیل بێکلۆیی** دیبوو لە شاخ هاتووچۆی کردوون، لەناو بازاڕی قەڵادزێ ناسیەوەو گرتی. لە ئیستخبارات خستیانە ژێر ئەشکەنجەی زۆر توند، ماوەیەك خۆی ڕاگرتبوو بەڵام **حەمە عارەب** وازی لێ نەهێنا بوو تا ئیعترافیان پێ کردبوو. ئەحمەدعەبدولا پەیوەندی بە **ئەحمەدی کاکەمین**ەوە هەبوو لەناو شار. ئەحمەدی کاکەمین زانی بووی گیراوە، لە جیاتی ئەوەی خۆی بشارێتەوە تا بزانی چی بەسەردێ، ئیعتراف دەکات یان نا، کەچی لە هەولْدا بوو بۆ بەردانی و بە ئاشکرا هاتوچۆی دەکرد. هەر ئەوندەی زانی پشت ملیانگرت و بردیان، وتیان ئیعترافت لە سەرکراوە. ئینجا یەك لەدوای یەك ئیعترافیان کرد: ١٠ کەس گیران بەم ناوانە:

- ئەحمەد عەبدولا ئیسما عیل/ تەتەر بوو
- ئەحمەدی کاکەمین / قیادەی موەقەت
- ئەحمەدی حەمەی عەولاێ/ قیادەی مۆقەت
- ئەحمەدی تەنەکەچی/ قیادەی مۆقەت
- لەتیف عەبابەیلەیی ناسراو بە (لەتیفی بانق) کاتبی بانق/ قیادەی موەقەت
- مەحمودی مامە لاوە/ قیادەی موەقەت



- عوسمان شەفیق / بزووتنەوە
- حوسێنی ڕەسواغا / بزووتنەوە
- ڕەسوی میرزا دلشاد/ بزووتنەوە
- خدری ڕەسو شەملۆر/ بزووتنەوە

(٨) کەس ئیعترافیان کرد و لە سێدارەدران.

ئەم دوو کەسەش کە ئیعترافیان نەکرد بە ٢٠ ساڵ حوکمدران:

- ئەحمەدی تەنەکەچی
- مەحمودی مامە لاوە

ئیعتراف نەکردنی ئەم دوانەش بوو بە هۆی ئەوەی خەڵکی سەر بە قیادە زۆرسەلامەت بن، ناوی گرتنی نەبێت و بمێننەوە. برادەرێکی من و مەحمود کەسایەتیەکی ناسراوە بەناوی (...). ئێستا لە دەرەوەی وڵاتە، دەمانچەیەکی شازدە خۆری وەك برادەرایەتی بە ئامانەت دابوو پێمان. ویستبویان ناوی ئەویش بدەن مەحمود نەیهێشتبوو ئامۆژگاری کردبوون. ئەوانەی گیران پێشوەخت هەموویان دەیانزانی ناویان هەیە، دەیانتوانی خۆیان بشارنەوە، یا ڕابکەن و بچن بن بە پێشمەرگە. کەچی بەداخەوە...

ئەم برادەرانەی خوارەوە هەموویان ناوی گرتنیان هەبوو ڕایان کردو بون بە پێشمەرگە. ئەوکاتەش بوون بە هێزێکی زۆر باش بۆ شۆڕش.

- دلاوەر تاهیر/ ناسراو بە (دلاوەرە قەڵەوی کۆیی)
- موختار عەبدوڵڵا حاجی غەریب
- قوبادی حەمە ساڵح لەنجە
- جەمال مەحمود جەلال (جەمالی خاوەرێ)
- دڵشاد مەحمود جەلال
- ئەحمەد پیرۆت موسا
- مەحمود پیرۆت قادر

- خدر محەمەد مەولان
- مەولود ئاغا
- محەمەد ئالّی
- سەید ئەنوەر
- بەکر حەمە مەروەیی
- خدر مەحمود جاف
- حەمەی پورئامان
- وریا حاجی ئەحمەد
- رەحمانی ئاوڕەحمان کۆدە
- ستار تەها مەعروف / ناسرا و بە(وشیاری  مام  تەها)
- عەبدولّای پور مرۆت
- حەمە حەسەن: ناسراو بە (حەمەی خانزادیٚ)
- حەمەی پورە زێنیٚ
- خدری حەسەنی فەقیٚ عەزیز
- عەبدولّای رەسوحەولە
- پیرۆتی رەسو حەولە

خەڵکێکی زۆرتر لەم ژمارەیە دۆست ولایەنگربوون خۆیان شاردەوە. **خدرە خوار،** بە بیستنی ئەم هەواڵە یەکسەر دڵی وەستا و شەهید بوو. رێکخراوی بزوتنەوە پەیوەندیان بە **رەسوڵ مەمەند** بەتایبەتی **عەلی عەسکەری** یەوە هەبوو. ئەم رێکخراوە لە رەسوڵ مەمەندەوە دوو دەمانچەیان بۆ هات. دەمانچەیەکی چواردەخۆر و دەمانچەیەکی ستار. لە رێگەی **دلاوەرە قەڵەو** بۆیان گەیشتە ناو شار. هەندێك لەم برادەرانە دوای ساڵێك و زیاتر لە ساڵێك هاتنەوە خۆیان تەسلیم بە رژێم کردەوە. کەسوکاری زۆربەشیان گیرا و رەوانەی خوارووی عێڕاق کران. **خدری حەسەنی فەقی عەزیز،** ماوەیەك هاتەوە بوو بە ئەمن و چەکی بۆ رژێم هەڵگرت. خەڵکێکی زۆر لە



ترسی خدر خۆی شاردەوە، بەتایبەتی ئەو کەسانەی خدر لە کاتی پێشمەرگایەتیدا هاتووچۆی کردبوون و لە ناو شار دەیناسین. یەك لەوانە (**وشیاری مام تەها - وشیاری نانەوا**) بوو. نەیدەوێرا بچیتە دوکان کاسبی بکات، دەترسا خدر ناوی بدات بە ئیستخبارات. شەوێك من و وشیار چووینە لای خدر، تەنیا یەك کەسی لەگەڵ بوو، ئەویش **حوسێنی حەمە ئاغای ناودەشت** بوو. خدر بە رەحمەت بیٚ زۆر زمان پیس و سەرسەری و بەدمەست بوو. هەر بۆ سەیر و گاڵتە تەقەی لیٚ دەکردی. ئەو کاتە سەرخۆش بوو زۆر جنێوی پێمان دا. جیامان کردەوە و زۆر قسەمان کرد. گوتم: خدر پێم بڵیٚ ناوی کەست داوە؟. گوتی: نەخێر. گوتم بە نیازنی ناوی کەس بدەی؟ گوتی: بۆ من لە کورد شۆراوم ئەی ئەوانەی ئیعدامکران برادەری خۆشەویستی من نەبوون؟. گوتی: هەر کورەکەی جارانم چ ئیشێکت هەبوو بۆ تۆی دەکەم. ئینجا کەوتە جنێودان بەو کەسانەی ناچاریان کردبوو لە داخی ئەوان ئەو رێگایەی بگرێتەبەر. کە ئەو دوو رێکخراوە ئاشکرابوون، خەڵکێکی زۆر گۆشەگیربوون و خۆیان شاردەوە. من لەناو بۆدی گەلابەی **عەلی حاجی خدر چنارنەیی** سواربووم چوون بۆ سەنگەسەر. شەو لە ماڵە خزمێك بووم بەیانی زوو هاتمە سەرجادە بچم بۆ کۆیە. دەستم بۆ پاسێك راگرت سەیرم کرد **عەبدولّای حوسێنی حاجی عەبدولّا** یە، پاسێکی مارسدسی شینی پیٚ بوو. بۆی راگرتم، جێگای نەما بوو، ناچار لەتەنیشت خۆی جێگای کردمەوە. کاك عەبدولّا تێمگەیشت ئانیشکێکی لە کەلەکەم کوتا. سەیرم کرد نوری نائب زابت لە پێشەوە دانیشتووە. بەڵام نوری منی نەك هەر نەدەناسی، چونکە هاتووچۆی نادیم نەدەکرد و بە دەگمەن ئێواران دەهاتمە ناوبازاڕ، منی هەرگیز نەدیبوو. دیار بوو عەبدولّا عەرەبی باش دەزانی، لە رێگا وردە وردە پرسیاری لە نوری کرد، تا وەقسەی هێنا. لە راست مجمع دوائیری ئێستای رانیە کاك عەبدولّا پرسیاری لەبارەی گیراوەکان لە نوری کرد, ئەویش گوتی:

هەموویان ئیعترا فیان کردووە، تەنها **مەحمود لاوە** و **ئەحمەدی تەنەکەچی** گەواد ئیعترافیان نەکردووە. نوری گوتی وەك زەلاتەمان لیٚ کردوون ئیعتراف ناکەن. کاك

عەبدولاَ گوتی: دیارە هیچ نین نوری گوتی نا هەموویان ئیعترافیان لە سەر کردوون و شاهیدن لە سەریان، بەس خۆیان ئیعتراف ناکەن. نوری گوتی: بۆ کوێ دەچن لەهەیئەی کەرکوك ئیعترافیان هەر پێدەکەن. نوری لەبەر ئەوەی ئیعترافی بە جەماعەت کرد بوو، وەك پاداشت نەقڵی شارەکەی خۆیان کردەوە، واتە موسل. ئەو رۆژە بەیەك جاری دەڕۆیشت خۆاحافیزی یەکجارەکی لە کاك عەبدولاَ کرد.

حەمە عارەبیان بەرەلاَ کرد بوو، لەبەرئەوەی کورد بوو بەلایانەوە گرینگ نەبوو بکوژرێ، تەنانەت ئامۆژگاریشیان نەکردبوو خۆی بپارێزی. ئەوکاتەی ئەو جەماعەتە گیران، مدیری ئیستخبارات نقیب حسین ئیجازە بوو، بەپەلە گەرایەوە. گوایە بە ئیستخباراتەکانی گوتوە ئەم شارەتان بۆ واتێکداوە. نازانم ئەم قسەیە تاکوێ راست بوو! چونکە شارەکە تەواو تێکچوو بوو. جرتووفرتی مەفرەزەی ئیستخبارات هەموو خەڵکی هەراسان کردبوو. زۆربەی خەڵك نەدەهاتە ناو بازاڕ. ئەوی راستی بێ، دەمانزانی **نقیب حسین** شیعەیە و خەڵکی شاری عەزیزیەیە. **نائب زابت کەریم** کە چالاکترین نائب زابتی ئیستخباراتی قەڵادزێ بوو،کورد بوو لە کەرکوك دادەنیشت. دەیانگوت خەڵکی عەسکەرەو، خزمی عەلی عەسکەریە. ئەو کاتەی ئەم خەڵکە گیران **عەریف بەکر** و **عەلی بابکر چاو جوان** دەوری زۆر خراپیان بەرامبەر ئەو خەڵکە گیراوە هەبوو. نقیب حسین لەهاوینی **١٩٨٠** بە بۆردومانی فڕۆکەی ئێرانی لە معەسکەری **گۆمان** بریندار بوو، دەستی شکاو نەگەڕایەوە. دوای ئەو **رائد عیماد** هات. دوای ئەویش **نەقیب محمد** بوو بە مدیری ئیستخبارات. ئەویش پیاوێکی زۆر سەرسەری بوو. حەزی لە شەرە جنێو دەکرد. هەر رئیس جاشێك جنێوی بە دایك و خوشکی نەدابا خۆشی نەدەویست. بەردەوام شەرە جنێوی لەگەڵ سەرۆك جاشەکان دەکرد. دوای ئەویش **نەقیب عەلی** هات.

**حەمە عارەب** تاوانباری سەرەکی بوو لە گرتنی ئەم خەڵکە. بێ منەت بوو شەو و رۆژ بە کۆلاَنان دا دەسوڕایەوە وەك هیچی نەکردبێ!. وەك ئەوەی ئەم شارە پیاوی تێدانەبێت!. شەوێك سەر لەئێوارە، **خدری حەسەن گۆشتە** لەکۆلاَنی ماڵێ **حەمەوردیل**،



دایە بەر دەمانچە و زۆر بەخەستی برینداری کرد. ئەو کاتە گیراوەکان لە سجن حوکمدرا بوون کە ئەم هەواڵەیان پێگەیشت زۆر خۆشحاڵ بوون. حەمە عارەب دوای ماوەیەك لە نەخۆشخانەی عەسکەری کەرکوك چاك بۆوە و گەرایەوە قەڵادزێ. وەك هیچی بەسەر نەهاتیبێ و هیچی نەکردبێ. ئەمجارە کورێکی مەردی تری ئەم شارە، بە ناوی **محەمەدی عەلی مەلا تۆفیق** کە خزمی **ئەحمەد کاکە مین** بوو، بە رۆژی رووناك لە ناوەندی بازار، لە ناو ئەو هەموو جاش و عەسکەرە، دەمانچەی لە سەرسەری راگرت و کوشتی، لاشەکەی بەسەر تاسەکەی جاددەی ناو بازاردا کەوت. ئەو تاسەیە تا راگواستنی قەڵادزێ **بەتاسەی حەمە عارەب** ناودەبرا.

**ئەحمەدی تەنەکەچی** و **مەحمودی مامە لاوە** دوو پاڵەوانی خۆڕاگری ریکخستنی ناو شار بوون. خەڵك پێی وابوو دوای راپەڕین میدالیای خۆڕاگری بە گەردنیانەوە هەڵدەواسن. کەچی بە داخەوە مەحمودی مامە لاوە تادوای رووخانی رژێمیش، بە زەکات و یارمەتی خەڵك دەژیا، ئێستاش نەمر نەژی مووچەیەکی دەدەنێ وەك ئەوەی خێری پێبکەن! ئەحمەدی تەنەکەچیش لە ساڵی **٢٠٠٧** دا لە **برسان مرد!** و کوڕەکەشی دوای باوکی پەنای بردە بەر مەشروب خواردنەوە و بەو داخەوە لە تەمنێکی زۆر کەمدا سەری نایەوە..

کورد دەڵێ قسە قسەی لێدەبێتەوە. واتە گێڕانەوەی هەر بەسەرهاتێك چەند بەسەرهاتی تر لە خۆی دەگرێ. لەبیرمە، **رەسوی میرزا دڵشاد** لەو ژوورە سجن کرا کە بە دەستی خۆی دیوارەکانی دانا بوو. دوایی لە هاوینی ساڵی **١٩٧٢** ئەوخانوە بوو بە ئیستخبارات.

دوای ئەوەی بارودۆخەکە ئارام بۆوە کەس لەم بارەوە لە خۆی نەدەترسا بگیرێ. بروسکەیەك بۆ بڕێبەرایەتی پۆلیس هات کە کەس و کاری گیراوان دەتوانن بچن بۆ مواجەهەی جەماعەت، چونکە حوکمدرابوون بە ئیعدام. خەڵکێکی زۆر چووین. ئەو شەوە لە ئوتێل ماینەوە. بەیانی چووین بۆ بینینیان. ریز بووین جوان هەموو گیانیان پشکنین. مۆریان لەدەستمان دا. هەرلەوێ عەلی سەید ئەحمەد لەگەڵ پۆلیسەکان

کردی بە دەمەقالێ. گیراوەکان بەیەکەوە سرودی ئەی رەقیبیان دەگوتەوە. چووینە ژوورەوە. بەندیخانەکە بینایەکی چوار گۆشە بوو. سێ لای رێڕەو بوو. دیوارەکانی نزیکەی (٨) مەتر بە رز بوون. هەموو گۆشەکان بورجی پاسەوانییان لەسەر بوو. تەلی درکاوی بەدەوریدا رایەڵ کرابوو. ئەو خەڵکەی هاتبوون بۆ مواجەهە لە رێرەوەکەدا دایاننان. رێرەوەکە نزیکەی **٥** مەتر پان بوو.و ژووری تاکەکەسی لەگۆشەکان دیاربوو، پێشەکەیان شیشەی ئاسن بوو. پێش ئێمە سجنی تێدا بوو لەبەر مواجەهە لایان بردبوون. ئاو و پارچە سەموونی رەقی لێ بوو. ئەو نووسینانەمان دەخوێندنەوە کە بە کوردی لەسەر دیوارەکان نوسرا بوون. ناوی سەدان رۆڵەی کوردی بەسەر دیواری زیندانەکەوە بوو. ئەو خەڵکە بواری هەبوو بە ئازادی قسە بکات. لە پیاوانی رژێم کەسمان لا نەبوو. پۆل پۆل دانیشتبووین کتوپڕ **عوسمان شەفیق** دەرکەوت و بە دەنگی بەرز دەستی بە جنێودان کرد بە **کەمالی برای**، هاواری دەکرد دەیگوت گەوادەکەی برام لەگەڵ جەللادەکەم هاتۆتە سەردانم. کەمال لەگەڵ نوری ئیستخبارات بە یەکەوە چووبوون بۆ مواجەهەی عوسمان. نوری گوتی عوسمان من رەفیقت بووم، خیانەتم پێنەکردووی، خەتای خۆت بوو هەی عوسمانی...؟ ئەو قسانەی کرد و لەترسان رۆیشتە دەرەوە. لە سجنەکە دووکەسیان لەگەڵ بوو یەکیان بە ناوی **جەمالە رەش**، کۆمەڵەی رەنجدەران بوو گیرا بوو، خەڵکی سلێمانی بوو. ئەوەی تر ناوی **مامۆستا جەمال خۆشناو** بوو، لە کۆیە دادەنیشت. گیراوەکان زۆر باسی قارەمانی و ئازایەتی ئەم دوو کەسەیان دەکرد.

لەوکاتەدا دیمەنێکی زۆر دڵتەزێنم بینی کە خەرگیز لە بیرم ناچێتەوە. **کوڕێکی شێت** حوکمدرا بوو بە ئیعدام. دەستی لە فافی پێوەبوو لەمەچەکیەوە بڕابوو. ئەم کورە کاتی خۆی شێتیك بووە شەو رۆژ ئاوارەی دەشت و کێو. قومبەلەیەك دەدۆزێتەوە و لە دەستی دا دەتەقێ. باوکەکەی بۆیی گێڕاینەوە گوتی: کە زانیم یەکسەر هێنام بۆ نەخۆشخانەی چوارتا، لەوێوە حەواڵەی نەخۆشخانەی عەسکەریان کرد. باوکەکە گوتی کوڕەکەمیان بزر کرد. ئەوەندەم زانی لە شورتە بانگیان کردم



و، گوتیان کورەکەت حکومدراوە بە ئعدام، دەتوانی بچی مواجەهەی بکەی. گوتی: هەموو خەڵك و بەرپرسان دەزانن ئەم کوڕە لە منداڵیەوە شێتە. مەزبەتەی ئیختیار و موختاری بۆ کرد بوو سودی نەبوو. ئاخیرەکەی ئیعدامیان کرد. کوڕەکە هەرچیەکمان لێدەپرسی دەیگوت: ئا. توومەس پییانگوتبوو پێشمەرگەی گوتبووی: ئا. باوکەکەی دەیگوت با بڕۆینەوە دەیگوت نایەمەوە ئێرە خۆشە، گۆشت دەخۆم! ریشم بۆ دەتاشن! باوکەکەی پیاوێکی کورتەباڵای رووتەڵە بوو، بە سیمایەوە دیار بوو هەژارە. **حاجی رەوف عەلی پەپاس** خوا خێری بنووسێ هەندێ پارەی لە قەڵادزەییەکان بۆ کۆکردەوە. بەڕێوەبەری زیندانەکە بەرامبەرمان راوەستا بوو. کەتەیەکی سورە بوو زۆر تاوانکار دیار بوو. وادیقەتم لێگرتبوو ئیستاش لە هەر شوێنێك بیبینم رەنگە بیناسمەوە.

زۆر لەم برادەرانەی گیران دۆستایەتیان لەگەڵ ئەمن و ئیستخباراتەکان هەبوو. پێیان وابوو لە رێگای دۆستایتیتەوە ئیشیان باشتر دەڕوات. پیاوانی رژێم بەپێ خەسڵەتی پیشەکەیان دۆستایەتی نازانن. بەڵام هەندێ کار و پیشە هەبوو بەدەستخۆت نەبوو دەبوایە مەرحەباییان بکەیت و ناوت بزانن.

زۆر بەداخەوە ئەم دووکورە ئازایە مەحمەد عەلی مەلا تۆفیق و خدری حسن گۆشتە لە بواری بزوتنەوەی ئازادیخوازی کوردا بە دەست کورد شەهید بوون. مەحمەد عەلی مەلا تۆفیق سەردانی ماڵی باوکی کرد لە **بەستەستێن**، هاتنەسەری و کوشتیان. خدری حسن گۆشتە لە هەکاری شەهید بوو...

بێمەوە سەر رێکخستنی قیادەی موەقەت واتە سەرکردایەتی پارتی. من تا درەنگ بە تەواوی شارەزای مەحمودی مامە لاوە نەبووم. دوای ماوەیەکی زۆر یەکترمان ناسی بە باشی. ئەو قسانەی مەحمود لاوە دوای تێکچوونی شۆڕشی ئەیلول بۆی دەکردین، بەراستمان نەدەزانی، پێمان وانە بوو ئاگاداری هیچ شتێك بێت. مەحمود بە لایەنگری مام جەلال ناسرا بوو. کە لە سا ڵی ١٩٧٤دا دەبێتە پارتی، بە بڕیاری شۆڕش لە ناوشار دەمێنێتەوە و رێکخراوێك دروست دەکا. رۆژانە هەر

زانیارییەك هەبێ دەیدات بە شۆرش. دوای تێكچوونی شۆرش، مەحمود پەیوەندی دۆستایەتی لەگەڵ پارتی تێكنادات. ڕێكخراوەكەی رادەگرێ و دوای ٤ مانگ لە تێكچوونی شۆرشی ئەیلول، **سۆفی عەبدوڵای ئاڵان** دەنێری بۆ **كەرەج** بۆ وەرگرتنی هەواڵ. سۆفی هەندێك زانیار بۆ ڕێگای هاتوچۆ لەوكەسانەی دێنەوە خۆیان تەسلیم دەكەنەوە وەردەگرێت و بە ناوی كاسبیەوە، دەچێ بۆ گوندی پەسوێ. دەچێتەماڵی حاجی عەبدولرەحمان و میوانیان دەبێ و دەڵێ بۆ كار وكاسبی هاتووم. خاوەنماڵ دەزانێ میوانەكەی بۆ كاسبی نەهاتووە و كارێكی تری هەیە. سۆفی ناچار خۆی ئاشكرا دەكات و دەڵێ بە نیازی سەفەری كەرەجە و داوادەكات یارمەتی بدەن و بیگەیەننە كەرەج بۆ ماڵێ بارزانی. خاوەن ماڵ پتر ڕێزی لێدەگرێ و بەیانی زوو لەگەڵ زەلامێك بە ناوی كەریمەرەش بەرێیدەكات بۆ كەرەج. ئەویش دەیباتە میوانخانەی بارزانی. سۆفی بە دیتنی **كاك ئیدرس** شاد دەبێت. كاك ئیدریس سۆفی دەناسێ وادەزانێ لە ئێرانە و بۆ یارمەتی هاتووە. سۆفی دەڵێ من ئاوارە نەبووم هەر لە گوندەكەی خۆمانم لە پشدەر. دەڵێ پێمان بڵێ ڕێنمایت چیە؟ ئێمە چی بكەین؟ كاك ئیدریس هەندێ قسەی بۆ دەكات و بەسۆفی دەڵێت جارێ دەسڕاگرن سەربەخۆ ئیش مەكەن. سۆفی كە دەگەرێتەوە، قسەكانی كاك ئیدریس بۆ مەحمود دەگێڕیتەوە.

شەوێك من لەمەیدانی مەنگوڕان تووشی مەحمود بوم گوتی بەیانم پێیە بۆم هەڵواسە، ڕاستییەكەی بە قسەم نەكرد. ڕاست بوو مەرحەبامان هەبوو ئێواران جارجارە لای دادەنیشتم و بەگشتی باسی كوردایەتیمان دەكرد، نەك وەك تەنزیم. من خۆم پارتیم خۆشدەویست و مەحمودیشم هەر بە لایەنگری مام جەلال ناسیبوو، بۆیە نەموێرا ریشی خۆم بدەمە دەستی.

مەحمود سەربەخۆ بەبێ ئاگاداری و بڕیار، قەناعەتی بە لەتیفی بانق كرد بوو بەیانی بۆ بنووسێ. ئەویش دوای دەوام دەچۆوە ناو دائیرەی بانق و بەیانی دەنووسی و دەیدا بە مەحمود، ئەویش دەیدا بەو دۆست و برادەرانە خۆی و هەڵیاندەواسی. دوای ٤ مانگی تر، سۆفی دیسان لەسەر قسەی مەحمود ڕێگەی ئێران دەگرێتەوەبەر و



دەچێتە سەردەشت بۆ ماڵێ **مستەفای عەولای كەریمی**. لەگەڵ ئەوان دەچێتە كەرەج و بۆ لای كاك ئیدریس. كاك ئیدریس زۆر پرسیاری لێدەكات دەڵێ خۆتان ڕێكخراوێك پێك بهێنن بەناوی **ڕێكخراوی تایبەت** مۆریكیش بەو ناوە بۆ خۆتان دروست بكەن. دەڵی چاوەرێ بن و ئاگاتان لە خۆتان بێت لەماوەیەكی كەمدا شۆڕش رادەگەیەنین و كادر و بەرپرستان بۆ ناوچەكە دەنێرین. سۆفی دەگەرێتەوە و قسەكانی كاك ئیدریس بۆ مەحمود دەگێڕێتەوە. مەحمود ڕێكخراوەكە پێكدێنێ و مۆرێكیش بە **مستەفای كاكل** دروست دەكات. دوای ماوەیەك شەوێك **دكتۆر كەمال كەركوكی** دێت بۆ پشدەر، مەحمود لاوە و ئەحمەدی حەمەی عەولای و ئەحمەد كاكەمین لە بانووی دێی **هەڵاوێژە** دەچن بۆ لای و دەیبینن. پێكەوە بڕیار دەدەن ڕێكخستنی ناو شار دەست بە ئیش و كار بكات، دوای ماوەیەكی زۆر من و مەحمود لێك ئاشكرا بووین...

سەبارەت بە ڕێكخستنی كۆمەڵەی ڕەنجدەران ئەوەندەی من ئاگاداربم ئەو كاتە لەناو شار نەمزانیوە ڕێكخراوێك بەناوی **كۆمەڵەی ڕەنجدەران** هەبووبێت. ڕەنگە هەبووبێ من نەمناسیبن. یەك دوو جار شتێكی وام بەرگوێ كەوت. جارێكیان **نەجمەدینی حەمەی ساڵح شەیتان** لە زانكۆی سلێمان دیخوێند رۆژانی هەینی بەسەردان دەهاتەوە قەڵادزێ. رۆژێك بە یەكەوە پیاسەمان دەكرد گوتی دەزانی حزبێكی ماركسی كوردی لە شێوەی حیزی شیوعی پەیدابووە لەم رۆژانەدا بەیانیان لە ناو زانكۆ بلاْوكردۆتەوە؟ بەراستی ناوەكەم بەلاوە زۆر غەریب بوو، گوتم شیوعین، گوتی نەخێر شێوەی شیوعیەتن.

جارێكیش لەگەڵ **سەرداری حەمەدەمین شاڵقیت**، پێش ئەوەی بگیرێ پیاسەمان دەكرد، گوتی تا كورد چاوەڕوانی ئەوە بێت حیزبی بۆرجوازی قەومی رزگاری بكات هەرئەوە حاڵی دەبێت. گوتم وەك چ حیزبێك؟ گوتی وەك ئەو حیزبە پارتیەی، من و جەنابت دوای كەوتبووین بۆ ئێران. گوتم ئەی دوای چ حزبێك بكەوین؟ گوتی مێژوو بخوێنەوە هەموو گەلانی ژێر دەست بە ڕێبازی ماركسیەت رزگاریان بووە. ئەمجار تۆزیك باسی ماركسیەتی بۆ كردم. كە گیرا زانیم ئەندام بووە لە ڕێكخراوی كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی كوردستان.

وەکو باسم کرد ئێمە لە ناو شار تا رادەیەك یەکترمان نەدەناسی. ناسینی پیاوانی رژێم لە نەناسینیان باشتر بوو، چونکە ئامانیان نەبوو، دۆستایەتییان نەدەزانی. بەڵام هەندێ کارو پیشە هەبوو بەدەست خۆت نەبوو ناچار دەبووی بیانناسی.

ساڵێك من کارێکم کرد، پیاوچاکێك کە ئێستا ماوە و تەقریری لێدام. ئەمنەکان لەجیاتی من **وشیاری مام تەهایان** گرت، چونکە وشیار بەهەویەی نفوس ناوی **ستار تەهایە** ناومان لەیەك دەچوو. ناوەکەی ئەو لەسەر مۆڵەتی نانەواییەکەی نووسرابوو بەو پێودانگە گرتیان. کە زانیم وشیار گیراوە، لە دۆستێکم پرسی کە دۆستایەتی لەگەڵ دائیرەی ئەمن هە بوو بە ناوی (...): گوتی لە سەر ئەوشتە گیراوە زانیم بەهەڵە لە جیاتی من گرتویانە. وشیاریش زانیبووی بەهەڵە گیراوە پتر لە دە رۆژ ئازارو ئەشکەنجەیەکی زۆر خۆی راگرت و ناوی کەسی نەهێنا. هەرچەند دەمزانی لەگەڵ بزووتنەوەیە و یەکترمان باش دەناسی بەڵام هیچی نەدرکاند. بەراستی شایانی تەقدیر و رێزلێنانە. ئەو دەڤەرە ئەوەی باش بوو، هەرکەسێك تەقریری لێ دابایت زوو دەتزانی کێ بووە. منیش هەر زوو زانیم کێ ئیخباری کردووم.

رۆژی **١٩٨٧/٩/١٨** پیاوانی رژێم هاتن بمگرن، من توانیم دەربازبم. بەڵام دایکم و باوکم و خوشك براکانم هەموویان گیران. دوای **٣** کاتژمێر زانیم کێ بووە دەمامکی خۆی کردووە و لە سەیارەی ئەمندا ماڵی ئێمەی نیشانداوە. ئێستاش ئەو کابرایە ماوە و کاربەدەستە!.

هەر کەسێك دژی رژێم بوایە خەڵکی ناوچە کە هاوکارییان دەکرد. بۆ نموونە بە سەدان عەرەبی شیعە هاتن و خەڵکی بەبێ موقابل هاوکارییان کردن و بردیانن بۆ ئێران و لە دەست رژێم رزگاریان کردن.

لە رۆژی **١٩٨٢/٨/٢٠ حوسێنی مزەمید** کە ناسراوە بە **حوسێنی پورحەلیمێ**، لە رێگەی برادەرێکی خۆی پیاوێکی قاچاخچی عەرەب رووی لە ماڵێ کرد بوو تا لە دەست رژێم رزگاری بکات. کاك حوسێن داوای لە ئێمە کرد دەربازی بکەین و بۆی بگەیەنینە ئێران. ئەم چەند برادەرەی لە خوارەوە ناویان دەهێنم بە یەکەوە لەگەڵ



خۆمان بردمان بۆ ئێران لەگەڵ ئەو برادەرانە زۆر بە رێگەیەکی ناخۆش بە ناو زنجیرە **قەندیل** دا لە رێگەی **قڕناقاو کرمە سواراندا** گەیاندمانە **کۆنە لاجان** لە ئێران. ئەوکاتە پارتی لە ئەستێروکان بوو. داوامان لێ کردن هاوکاریمان بکەن. کەچی تەنانەت بەرگەی هاتوچۆی ناو ئێرانیانیشیان بۆ نەکردین. هاتین بۆلای **حزبی سۆشیالیست**. کاك **رەسوڵ مەمەند** بەرگەی هاتوچۆی یەك مانگەی بۆ کردین. نامەی شەخسی داینێ بۆ **خاڵە حاجی**. جلی کوردیمان لەبەر کابرای عەرەب کرد بوو، دەبوایە دۆخینیشی بۆ ببەستینەوە. زۆر بە زەحمەت گەیاندمانە کۆنە لاجان. لەوێ گوتمان ئەوە پایەگای ئێرانە. گوتی کەواتە خواحافیز من لێتان جیا دەبمەوە لە تاران یەکتر دەبینینەوە. گوتی:

ـ ئینجا ئێوە کارتان بە من دەبێت ئەوسا دەزانن من چیم. لەوێ لە یەك جیابوونیەوە و مەوعیدی ئەوەمان دانا دوای (٥) پێنج رۆژ لە تاران لە ئوتێل **پانسویس** لە فولکەی **فردەوسی** یەکتر ببینینەوە. ئێمە دوو رۆژ دوا کەوتین. کە گەیشتین، خاوەن ئۆتێلەکە پێی ووتین ئەوە دوو رۆژە لێتان دەپرسن. بۆ ئەوەی بوو ئەگەر شتێك لە خۆماندا شك بەرین ئوتێلەکە بەجێبهێڵین و بڕۆین. تەلەفۆنی کرد، چەند کەسێك بە دوو سەیارە هاتن، زۆر بەڕێز و تەقدیرەوە سواری سەیارەیان کردین و بردیانینە شوێنێك و گوتیان ئەمە ماڵی سەرۆك کۆماری عێراقی داهاتووە، ماڵی **موحسین حەکیم** بوو!، دەیگوت:

ـ ئەوە ماڵی (صدام حسین) نییە بە کارەبا سەرکەوی؟ سەرۆك کۆماری ئێمە وەك خەڵك دەژی. برنج و شلەیەکی بێ گۆشتمان خوارد، بەڵام زۆر رێزیان لێ گرتین و داوایانکرد لەگەڵ ئەوان ئیش بکەین، گوتی:

ـ چیتان دەوێت داوا بکەن؟

ئێمە قبوولمان نەکرد و گوتمان:

ـ ئێمە پارتین داوا لە حزب بکەن چیتان بوێت بۆتان دەکەین.کێتان دەوێ لە ناو بەغدا بۆتان دەرباز کەین.

ئەو پیاوەی ئێمە ئاوەدیومان کرد، ناوی **محەمەد جەواد عەلی** بوو بە ناوی نهێنی **أبو مرام**. خەڵکی نەجەف بوو. باوکی مەلا بوو ئیعدامکرابوو. خۆی دەرچووی زانکۆ بوو پیاوێکی لەگەڵ خوی هێنابوو بۆ ئوتێل بمانناسێ ناوی **أبو أسماء** بوو، دەیگوت:

ـ ئەمە وەزیری مواسەلاتی عێراقی داهاتووە. ئەگەر سەرکەوتین!

لە راستیدا ئێمە بێ نمەك بوون و لەگەڵ سۆشیالیست بێ وەفاییمانکرد. چونکە کاك رەسوڵ مەمەند وەرەقەی بۆ کردین و نامەی شەخسی داینێ بۆ خاڵە حاجی ئەویش لە ورمێ لە **ئۆتێل حافز**، ژووری پێداین. خاڵە حاجیش نامەی داینێ بۆ **بێستونی** برای لە تاران. خواهەڵناگرێ ئەویش زۆر یارمەتییان داینێ. سەرەڕای ئەوەی پارتی بەرگەی هاتوچۆشی بۆ نەکردین، کەچی ئێمە چاکە و پیاوەتیەکەمان لای **مەجلیسی ئەعلا** بە ناوی پارتیەوە تەواوکرد. ئەوانیش گوتیان ئێستا شوکر و تەقدیرتان بۆ دەنێرین بۆ کاك مسعود. ئەو کابرایەشمان لە کاك رەسوڵ ئاشکرا نەکرد و نەمانهێشت بیبینێ. دوای ماوەیەك زانیەوە زۆر گلەیی لێکردم. گوتی ئەگەر داباتان بە ئێمە هەندێك چەکمان لە ئێران پێ وەردەگرت...

ئەم برادەرانەی هاوکار بوون لە بەرێکردنی ئەو کەسانەی دەهاتن بە رێیان بکەین ئەمانە بوون:

١. رەحیمی خدرە سپیلکە.
٢. سەروەری مەحمودی سۆفی ئەنوەر.
٣. بەکری سەعید کەریم.
٤. بەختیاری حەمە تایەر.

ئیشی رێکخستنی ناو شار زۆر ناخۆش و ترسناك بوو. ساڵی **١٩٧٨** هەندێك نووسراومان بۆ هاتبوو لە ماڵێك لە سەنگەسەر بۆیان دانابووین. من سەیارەکەم شکابوو داوام لە **دکتۆر حەسەن محەمەدسوورە** کرد کە ئێستا ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتیە ـ سەیارەیەکی جۆری نەسری هەبوو لەگەڵم بێت ئەویش یەکسەر هات. چووین بلاوکراوەکانم هێنا، دکتۆر زانی بۆچی چووم، بەلام نەیزانی چیم پێیە. پێش ئەوەی بگەینی سەیتەرەی سەررێگا، لە پێش هەوائی سەیارەی دکتۆرم دانا. دکتۆر



هەستی پێنەکرد. کە گەیشتینە سەیتەرەکە نوسراوەکان کەوتنە بەر پێمان، یەکسەر هەردووکمان رەنگمان زەرد بوو، ئیستخباراتی سەیتەرەکە تێمانگەیشت کە ئاسایی نین و گوتی:

ـ ها؟؟؟

ـ دکتۆر عەرەبی باش دەزانی خۆی وەك سەرخۆش لێکرد و گوتی:

ـ سەری خۆمان گەرمکردووە سەرویرەمان خواردۆتەوە.

ئیستخباراتەکە باوەڕی کرد و یەکسەر ئیزنی داین، بەلام هەتاکو قەلادزێ دکتۆر هەر جنێوی دا. هەقیشی بوو گوتی بۆ پێت نەدەگوتم شوێنی باشتر هەبوو لێم دەشاردەوە. منیش پێموا بوو ئەگەر پێی بلێم چیم پێیە رەنگە بترسێ و نەویرێ لە گەڵم بێت یا لە گەڕانەدەاسوارم نەکات. گوتی جارێکی تر پێم بڵێ چیت پێە شوێنی باشم هەیە خۆم دەیشارمەوە. زۆرجاران بە چاوم دەداتەوە و دەڵێ خەریك بوو بە ئیعدام کردنم بدەیت. هەر چی پێ گوتبام هە قی بوو...

ئەوە بۆ مێژوو باس دەکەم، خەڵکی کوردستان بە گشتی و ناوچەی پشدەر بە تایبەتی، لە خۆیەوە دەبوون بە پارتی بێ ئەوەی کەس بەرەو پیریان بچێت و داوایان لێ بکات. ئەمەش لە خۆشەویستی و مەزنیی کەسایەتی **مستەفا بارزانی** نەمر بوو. ئەم خەڵك خۆی بەر دەروێشی بارزانی و رێبازەکەی دەزانی، بۆیە رێگای دوورو درێژی دەبڕی و خۆی دەگەیاندە بارەگا و سەرکردایەتی پارتی. بەناو ئەو هەموو حزبانەدا تێدپەڕی کە زۆر بەیان دوژمنایەتی خەڵکی پارتیان دەکرد. کەچی ئەوانیش بێ ئەوەی تقدیریان بکەن زۆر بە سارد و سڕی پێشوازیان لێ دەکردن. لەگەڵ ئەوەشدا ماوەی چەند ساڵێك خەڵکی پشدەر چاوەڕێ بوون بارەگای پارتی بگەڕێتەوە ناوچەکە، بەلام بەداخەوە لەبەر چەند هۆکارێك ئەم ئاواتەمان تا دوای راپەڕین نەهاتە دی. ئەوەندە دوزانم رژێم حسابی تایبەتی بۆ پارتی دەکرد.

خەڵك یا لە بەر سەربازی و چەك هەڵگرتن یا بێزاری لە رژێم، دەچووە دەرەوە و دەبوون بە پێشمەرگە. زۆر کەس دەیانویست بچێنە ناو ریزەکانی پارتی، بەلام حزبیان

نەدەکرد لە ناوچەکە دوورکەونەوە. لەبەرئەوەی پارتی دوور بوو، بەناچاری دەبوون بە پێشمەرگەی حزبی سۆشیالیست. لە زۆر کەسم دەبیست دەیانووت حزبی سۆشیالیست باڵێکە لە پارتی، سۆشیالیستیش سوودی لێ وەردەگرتن. زۆربەی کادیرەکانی حزبی سۆشیالیست هاوسۆز بوون لەگەڵ پارتی، هاوکاری خەڵکی پارتیان دەکرد، دیارە وەك شەخس نەك وەك حزب.

دووری بارەگاکانی پارتی لە شارەوە زۆر ناخۆش بوو بۆ ڕێکخستنەکانی ناوشار. بەڵام کادیری عەسکەری و سیاسی سۆشیالیست کە زۆریان ئێستاش ماون، خەڵکی ناوچەکە بوون، چیم ویستبا بۆیان دەکردم. جگە لەوەی کە سەرکردایەتی و بارەگاکانی پارتی لە شارەکان دوور بوون و کاتی لێ قەومان بە ئاسانی دەستمان پێیان ڕانەدەگەیشت. سەرەڕای ترسی ڕژێم، ترسی لاوەکیش لەسەر ئەندام و لایەنگرانی پارتی هەبوو.

لە ساڵی ١٩٨١ **کەمال حەسەن چاومار** لە ڕێگەی **فوئادی حاجی ئەحمەد** واتە **فوئادی مزەمید** هاتبوو بۆ قەڵادزێ. فوئاد داوای لە من کرد بۆی دەرباز بکەم، چووم بۆی باس کردم بۆ دەڕوات و لەچی دەترسێت گوتی بە نیازن بمکوژن، منیش لەگەڵ خۆمدا بردم بۆ گوندی **چۆمخڕکە**. وڵاغێکم بۆ گرت و بە **عەبدوڵای حەسەنی مام وسو برای وسوأغا** دا ناردم بۆ لای کاك ڕەسوڵ مەمەند. کاك ڕەسوڵ زۆر ڕێزی لێ گرتبوو و داواشی لێ کرد بوو لە ناو سۆشیالیست بمێنێتەوە، **مام عبدولاّ** کە هاتەوە گوتی: کاك ڕەسوڵ بە پێکەنینەوە وتویەتی:

ـ ستار ئێمەی کردۆتە پۆستەچی پارتی. کە کاك عەبدوڵڵا بۆی گێڕامەوە بە پێویستم زانی سەردانی کاك ڕەسوڵ بکەم. نیوەشەوێك لە **دەراوی دۆڵەتوێ** خۆم گەیاندە خزمەتی. دووربینێکی چاك و تاوڵەیەکی بچوکی چاکم هەبوو بە دیاری بۆم برد. دیارە میوان دیاری پێ بێت خۆشەویستر دەبێ. زۆری پێ خۆش بوو، نیوەڕۆ نانم لای کاك ڕەسوڵ و ملازم تاهیر خوارد. خواردنەکە زۆر ناخۆش بوو. **ملازم تاهیر** چاکی دەخوارد دیار بوو بە لای ئەوانەوە خۆش بوو. بەمنی گوت: کاکە کوری شارە ئەم خواردنانەی پێناخورێ.



کاك ڕەسوڵ سەرەڕای ئەوەی دەیزانی ئیش بۆ پارتی دەکەم. زۆر خۆشیدەویستم و ڕێزی لێدەگرتم. هەموو جارێك کە دەچووم بۆ ئێران لە بارەگاکەیی ئەو دەمامەوە، یارمەتی دەدام و بەرگەی هاتوچۆی بۆ دەکردم. جگە لەوەش من زۆر لەگەڵ **مام خالیدی خەزوری** دۆست بووم. خوا هەڵناگری هەرگیز گوێم لێ نەبووە بە خراپ باسی پارتی بکات.

کاك ڕەسوڵ چەند پرسیاری لێ کردم.

یەك لەو پرسیارانە ئەوە بوو گوتی:

ـ دەڵێن **مەلا دەڵگەیی** لەگەڵ **حاجی مەحمود ئاغا** ئاشت بۆتەوە و یەکتریان بینیووە؟ گوتم:ئاگادار نیم.

دووەم پرسیاری کردی گوتی:

ـ لەبارەی **ڕەفیق پشدەری** چیت ئاگا لێیە؟ دەڵێن هاتۆتەوە خوارێ بۆ کوێ چووە؟ وتم دەڵێن هاتووە بۆ بەستەستێن و گەڕاوەتەوە **ناوزەنگ**.

گوتی: هەر ئەوەندە؟!

گوتم: ئەوەندە ئاگادارم.

گوتی: کەواتە ئاگات لە هیچ نییە.

ڕاپۆرتێکی دامێ خوێندمەوە ڕێکخستنەکانی سۆشیالیست ناردبویان. نوسرا بوو:

ـ ڕەفیق پشدەری شەو گەیشتە بەستەستێن. لە ماڵی فلان(...) لایدا. بۆ نانی نیوەڕۆ چۆ بۆ ماڵی فلان (...). لە سلێمانی سەیارەی جۆری **نصر** ڕەقەم (...) هات بردی بۆ قەڵادزێ بۆ (....). لە ماڵی **سمایلی قەساب**، نیوەڕۆ کفتەی خوارد. **برایمی دەلاك** هات سەرو ریشی تاشی.

کە خوێندمە وەگوتم پێموانیە ئەم ڕاپۆرتە ڕاست بێت کاك ڕەسوڵ بە توڕەییەوە گوتی: چۆن ڕاست نیە؟ گوتی: دیارەخزمایەتیتان هەیە دەتەوێ بۆی بپۆشی. گوتی: لەمبارەوە ئەمڕۆ دانیشتنمان لەگەڵ حیزبی شیوعی هەیە، ئاگاداری سەرکرایەتی یەکێتی دەکەین بزانین ئەوان ئاگادارن لەم سەفەرەی ڕەفیق پشدەری. گوتی ئێمە

خەڵکی ئاوامان لەگەڵە، شتمان لێ وننابێت. ئەوەی ئەم راپۆرتەی نووسی بوو وەك لەگەڵی بوبێ وابوو. کاك رەسوڵ گوتی:

ـ برادەرانمان دێنە خوارێ زۆر باسی چاکە و پیاوەتیت دەکەن.

لەبەرئەوەی من زۆر هاوکاری ماددی و مەعنەوی مەفرەزەکانی سۆشیالستم دەکرد. ئەوانیش چ ئیشێکم هەبوایە بۆیان دەکردم. ئەوکاتە بە مەحمود لاوەم گوت من عیلاقەی شەخسیم لەگەڵ کاك رەسوڵ خۆشە بە خراپ لێم تێنەگەن. عیلاقەی شەخسی زۆر گرینگە بتوانی بەکاری بهێنی بۆ بەرژەوەندی حزبەکەت. لە رێگەی **مستە فاغەفور** پێش ئەوەی بڕوا و ببێتە پێشمەرگە کوڕێکم بە ناوی (**جەمیل مەجید عەلی**) ناسی کە کادری حیزبی شیوعی بوو. کوردی فەیلی و ماڵیان لە بەغدا لە (**مدینة الثورة**) بوو. لە قەڵادزێ **نائب زابتی تەجنید** بوو، کوڕێکی زۆر ئازا و چاونەترس بوو. زۆر مجازەفەی دەکردز چیم ویستبا بۆی دەکردم. چەند دەفتەر خدمەی پێشمەرگەم هێنا خاوەنەکانیم پێ تەسریح کرد و بە ئاسانی بە سەیتەرەکاندا هاتووچۆیان پێدەکرد. کە لە شاخەوە داوایان دەکرد، جەمیل ئیجازەی بۆشی بۆ دەهێنام و خۆم پڕم دەکردەوە، ئیتر چ بۆ پێشمەرگە یا چ بۆ سەربازی فیرار. جارێك بۆ برادەریك هەموو سجلی دائیرەی تەجنیدی قەڵادزێی لەناو جانتایەکی گەورە ناو هێنای بۆ ماڵی ئێمە. کونیەی چەند کەسم بەخەتی خۆم پڕکردەوە. دەیگوت با خەتی من نەبێت. ئەو پێیدەگوتم منیش دەمنووسی. کونیەی چەند کەسێکم بە ئارەزووی خۆم پێ پڕکردەوە. مەحمودی مامە لاوەش ئاگادارە، بەبێ هیچ موقابلێك و هەدیەیەك، ئەوەی دەیزانی سەر بە رژێمە کونیەی عەسکەریەکەی لێ دەشێواند. لە رێگەی منەوە نامەی بۆ حیزبی شیوعی دەنارد و مەفرەزی حیزبی شیوعی دەبینی. لە ناوشار ئەوەندەی لە من ئەمین بوو هەر ئەوەندەش لە شوعیەکان. دوای ماوەیەك بە هۆی ئەوەوە نائب زابتێکی دیکەشم لە تەجنیدی قەڵادزێ ناسی ئەویش شیوعی بوو، برادەری جەمیل بوو مەسیحی بوو بە ناوی **ماهر**. لە پێشمەرگایەتی بە **فەرهاد** ناودەبرا. جەمیل هەر جارێك چوبایەوە بەغدا نەفەرێکی قاچاغی دەهێنا، منیش بۆم



بەڕێ دەکرد بۆ ناو شیوعیەکان ئەو نەفەلانە هەموویان عەرەب بوون. بەم جۆرە چیم وویستبا لە تەجنید بۆم دەکرا بێ هیچ پاداشت یا دیاریەك. رۆژێك جەمیل گوتی:

ـ دەمەوێ دائیرەی تەجنید تەسلیم بە حیزبی شیوعی بکەم و بێن بیبەن.

گوتم: چۆندەتوانی؟

گوتی: ڤیدیۆیەکم بۆ بەڕێ بکەن لەگەڵ چەند شریتێکی خۆش، بانگی حەرەس و جوندیەکانی سەربان دەکەم سەیری بکەن. هەر کە گلۆپی رووی رووبارەکەم کوژاندەوە، لێمان بێنە ژوورەوە و تۆزێکیشمان لێ بدەن. هەموو شتەکان بەرن. دیار بوو داوای لە حزبی شیوعی کرد بوو ئەوان پێیان باش نەبوو، نازانم لەبەر چ هۆیەك. من گوتم:

ـ جەمیل تەسلیم بە ئێمەی بکە وا دەکەم پارتی بەڕێت بکات بۆ خارج.

گوتی: نا من شیوعیم تەنها بۆ حزبی شیوعی ئەوە دەکەم.

ڕۆژێك هەستم کرد چەند کەسێك دەیانەوێ بیکوژن، ئاگادارم کردن، گوتم:

ـ ئەوە برادەری منە یەك خراپەی بەرامبەر بکەن ناوی هەمووتان دەدەم. بە ئەمن.....

فریای نەکەوتبام دەیانکوشت، نەشمدەوێرا بڵێم ئەوە شیوعیە چونکە ئەو قسەیە بە حکومەت گەیشتبا لە سێدارەیان دەدا. حزبی شیوعی لە هەموو حزبێك قاچاغتر بوو، بەتایبەتی لەناو سوپادا. جەمیلیش سەرەڕای ئەوەی لە ناوجەیشدابوو، تا پێی کرابا خراپەی رژێمی دەکرد. رۆژێکی تر جەمیل لە بەغدا گەڕابۆوە، بە پەشۆکاوی، هاتە ماڵەوە، ئەوەندە شڵەژابوو قسەی پێ نەدەکرا. گوتی:

ـ چیم لێ دەکەی ئەمری گرتنی ماهر دەرچووە، هەر بیگرن ئیعدام دەکرێت.

گوتم: لە کوێیە؟

گوتی: لە گوندی **کەرسۆنانە** لە ماڵی **حوسێن مەلا عەلی**، بەڵکو رزگاری بکەیت و بۆم رەوانەی ناو شیوعیەکان بکەیت.

گوتم: برۆ دەوامی خۆت بکەو خەمی منت نەبێ. لەگەڵ ماڵی **حوسێن مەلا عەلی** عیلاقەم نەبوو. نەمدەزانی چۆن بچم. چووم بۆ ژاراوە **عەزە مەرگەیی** لە لەگەڵ خۆم

هێنام و چوومە لای فەرهاد. شەرواڵێکی کوردی لەبەر کرد بوو. **حوسێن مەلا عەلی** متمانەی پێم نەبوو، لە ترسان قسەی دەبزرکاند. پشدەرییش پێیان عەیبە یەکێك روو لە دەرکەیان بکات پێشوازی لێ نەکەن، یا خیانەتی پێ بکەن و بەگرتی بدەن. ناهەقیشی نەبوو خۆ ئەگەر حکومەت بیزانیبا بە سەروماڵەوە ئەنفال دەکرا. کابرام لەگەڵ خۆم بردو گەیاندمە شوێنی خۆی. بەڵام ماڵی **حوسێن مەلا عەلی** تاکو راپەڕین، هەر دەترسان رۆژێك ئەو کارە بگاتەوە حکومەت. بۆ ئەو قسانەی من **سەلیمە سور** و **محەمدی حەسەن دەڵگەیی** (کە هەردووکیان پێشمەرگەی حزبی شوعی بوون) کە زۆر متمانەیان پێم بوو، ئاگادارن.

ئەو نموونانەی باسکران نیشانەی ئەوە بوو کە من پەیوەندیم زۆر خۆش بوو لەگەڵ حیزبەکان و هەموو لایەکیش چاك دەیانزانی من پارتیم، بەڵام پەیوەندی شەخسیم لەگەڵ شیوعیەکان زۆر باش بوو.

## دەربڕینی دەنگی ناڕەزایی قوتابیان

له رۆژی جەژنی نەورۆزی ساڵی ١٩٧٦، قوتابیانی ئامادەیی قەڵادزێ مۆڵەتیان له رژێم وەرگرت کە نمایشی شانۆیی کـاوەی ئاسـنگەر بکـەن. بەرپرسـانی حزبـی و حکومی ئەوسایان هەموو بانگهێشت کرد. شانۆگەری بەم پارچە هۆنراوەی مامۆستا هێمن دەستپێکرد کە بەکری ئەحمەد ئاغا خوێندیەوە:

**دەمگرێ ئەمما لە گرتووخانە رق ئەستوورترم**
**لێمدەدا ئەمما لەسەر داوا رەواکەم سوورترم**
**دەمکوژێ ئەمما بە گڕ جەللادەکەم دا دێمەوە**
**کوردم و ناتوێمەوە ناتوێمەوە ناتوێمەوە**

چەپڵەو فیتوو لێدان پتر لە پێنج خولـەك درێـژەی کێـشا. پیـاوانی رژێـم واقیـان وورما. چاوم لێ بوو پیاوێکی رژێم بۆ نەقیب حوسێن زابتی ئیـستخباراتی تەرجەمـە کرد. شانۆگەری بە ناو شانۆگەری کاوەی ئاسنگەر بوو، کەچی بە گـشتی هێرشـێکی ئاشکرا بوو بۆ سەر رژێم. لەسەر شانۆکەوە بە ئاشکرا پەنجەیان بـۆ بەرپرسـانی رژێـم درێژ دەکرد. هەر ئەوەندەی مابوو سواری سەریان بن. پیاوانی رژێم ئەوەیان پێ قبووڵ نەکرا. ئەمنەکان وایەری مایکرۆفۆنەکانیان بڕی و دەنگ نەما. جەماوەر هاواری کرد دەنگ، دەنگ. ئەکتەرەکان زانیان وایەری مایکرۆفۆنەکان بڕاون، ئەمجارە وا دەنگیـان بەرز کردەوە لە مایکرۆفۆنەکە بەرزتر بوو، وەك شـەڕ بکـەن وابـوو. نـەقیب حوسـێن مدیر ئیستخبارات گوتبوی ئەمە شانۆ نییە راگەیاندنی شۆڕشـە. پیـاوانی رژێـم بـە کۆمەڵ هەستان رۆیشتن وخەڵکەکەیان بەجێ هێشت. خەڵکەکە لێیان کردن بـە هۆپـە



لێدان و فیتولێدان، وەك ئەوەی شار بەدەریان بکەن. بە راستی لەم رۆژە رەشـەدا ئـەم چـالاکییە کـارێکی زۆر بوێرانـە بـوو، هەقـە لـەبیر نـەکرێ. ئـەم ئەکتەرانـەی شانۆگەریەکەشم لە بیر ماوە ئەوەی لە بیریشم چوو بێ داوای لێبووردنی لێ دەکەم:

| ناوەکان | شوێن و کاری ئێستایان |
|---|---|
| عەبدوڵا حەسەن خدر | بەرێوەبەری زراعەی بنگرد |
| دلێر زاهیرەشید | فەرمانبەری زراعەی هەولێر |
| بەکر ئەحمەدئاغا | ئەندازیارە لە دەربەندیخان |
| خدر مەحمودی کوێخابرایمی | برای عەزیزی ماملێ |
| ڕەحیمی خدرە سپیلکەی | فەرمانبەرە لە بریدی سلێمانی |
| مامۆستا قادر حسێن ئاغا | بەرێوەبەری قوتابخانەی ناوەندی قەڵادزێ |
| عەلی ئەحمەد خاسی | مامۆستایە |
| سالاری حوسێنی حاجی تایەری | منداڵ بوو دەوری زۆر جوانی هەبوو |

## خۆپیشاندانی پیاو ماقوڵانی قەڵادزێ

جگە لە زەبروزەنگ و بڵاوبوونەوەی بێکاری، ڕژێم هەوڵی دەدا خوو ڕەوشتی گەنجان تێکبدات. لە ڕۆژی (٦/٥/١٩٧٦) ڕژێم کۆمەڵێك ژن و پیاوی میسری بە ناوی شاری یاری **مدینە ألعاب،** هێنا بۆ ناو شاری قەڵادزێ کە پتر لە سێ لۆری کەلوپەلیان پێ بوو. لە شوێن فەرمانگەی پۆستە و گەیاندن و باخچەی ساوایانی ئێستا بارو بنەیان خست. خەڵك زۆری پێ ناخۆش بوو، دەسەڵاتیش نەبوو. وا ڕێککەوت حاجی غەریب کە پیاوێکی ناسراوی ناوچەکەبوو ئەو ڕۆژە کۆچی دوایی کرد. خەڵکێکی زۆر ئامادەی ناشتنی تەرمەکەی بوون. دوای ناشتن مامۆستای ئایینی مەلا دەڵگەیی گوتی:

ـ بڵاوە مەکەن دەچین ئەو لەشفرۆش و گەوادانە دەردەکەین.

مەلاو پیاو ماقوڵانی وەك **خدرە سپیلکە** و **مەلا سەعدی** و **سۆفی برایم وسەید ئەحمەد** لە پێش خەڵکەکەوە بە ناو بازاڕ دا ڕۆیشتن بەرەو دائیرەی سەرا. خەڵکی شار کەزانیان، ئەوەی مابووش دووکانی داخست و دوایان کەوتن. دائیرەی شورتە کە شاڵاوی ئەو خەڵکەی بینی دەرگای داخست، لە سەربانی دائیرە سەنگەریان گرت و کەوتە حاڵەتی ئامادە باشی. قائیمقام ناوی **ئەدیب عەبدوڵڵا** بوو، پیاوێکی تابڵێی ڕۆشنبیر و... خەڵکی دهۆك بوو، خەڵك لێی ڕازی بوو. هاتە ناو خەڵکەکە وگوێی لەداخوازییەکانیان گرت. وتی تکا دەکەم بڵاوە بکەن، بەڵێن بێ هەر ئەمڕۆ دەریاندەکەم. لە ماوەی **٣** کاتژمێردا دەریکردن. ئافرەتەکان لە **ئوتێلی شارەوانی** لەسەر تارمەکەوە سەیریان دەکردین و خەڵکەکەش تفی لێدەکردن. بەم جۆرە قسەی جەماوەر سەری گرت. خەڵك زۆر خۆشحاڵ بوون. دوای تێکچوونی شۆڕشی ئەیلول، ئەمە یەکەم هەنگاوی نارەزایەتی خەڵك بوو دژی ڕژێم.





وێنەی: پیاوەماقوڵان وریش سپییەکان کاتی گەڕانەوە لە خۆپیشاندانەکە لای مەحمود لاوە لایاندا پشوو بدەن مەحمود چای بۆ بانگکردن و دەستخۆشانەی لێکردن

## راگواستنی دانیشتوانی ناوچەی پشدەر

### یەکەم شاڵاوی راگواستن ١٩٧٧/٧/٢٥

لە ئاکامی ئەو هەموو نارەزایەتی و بەرەنگاربوونەوەی خەڵکی ئەو ناوچەیە لەم چەند ساڵەدا، دیار بوو رژێم پیلانی راگواستن و دوورخستنەوەی خەڵکەکەی بە چاکترین چارەسەر زانی. ئەوەبوو رژێم لە رۆژی (١٩٧٧/٤/٥) چەند فەرمانبەرێکی رانیەی ناردە بناری قەندیل سەرژمێری زەوی خەڵکەکەیان کرد. لە رۆژی ١٩٧٧/٧/٢٥) هێرشی کردە سەریان و رایگواستن بۆ دوو شوێن:

١. بناری قەندیل بەناوی ئۆردوگای **کۆمتان**.

٢ ·ئۆردوگای **چوارقورنە**.

لەو بەستە فرێدران بێ ئەوەی هیچ خانو و جێگەیەکیان بۆ دابین بکرێت، ساڵێش درەنگ بوو. (٧٠٠) حەوسەد خانووی بۆ دان بە دوو پەیمانکار. یەکێ لەو پەیمانکارانە **عەزیز عەبدولا** ی برای **سالار عەزیز** و، ئەوەی تریشیان **شێخ لەتیفی شێخ جەلال** بوو. بەڵام وەرزی باران بارین هاتە ئاراوە. خەڵکە راگوازراوەکە تووشی بارودۆخێکی زۆر نالەبار بوون. نیشتەجێ کردن و دامەزراندنی ئەم خەڵکە لە ژێر چاودێری راستەخۆی **ئەرشەدزێباری ـ پارێزگاری ئەو کاتی سلێمانی** وە قائیمقامی رانیە **کەمال توفیق نادر**، و مدیر ناحیەی **چوار قورنە، شێخ** قادردا بوو. هێزی عەسکەری و فرۆکەی هەلیکۆپتەر بەبێ هیچ گرفت و کێشەیەك خەڵکی گووندەکانیان هێنایە خوارێ. رژێم لەم شاڵاوە سەرکەوتوو بوو، تەنانەت زیانی یەك سەربازیشی لێ نەکەوت. خەڵکی ئەم گوندانەش لە عەشیرەتی **مەنگوڕ** و **ئاکۆ** بوون. لە سنووری گوندی **رەژێکەریان** ەوە تاکو گوندی **رەزگە** هەموویان چۆڵ کرد. لەم شاڵاوەدا رژێم تەعویزی باشی دا بە خەڵکەکە و تا ماوەیەك دڵیان پێ خۆش بوو!.



### دووەم شاڵاوی راگواستن هاوینی ساڵی ١٩٧٨

وەك باسمانکرد رژێم لە یەکەم شاڵاوی راگواستندا سەرکەوتوو بوو. بۆ دووەم شاڵاوی راگواستن هەر لە سەرەتای بەهاردا رژێم گشت گوندەکانی ئاگادار کردەوە:

ـ خۆتان بلاو نەکەن خەریکی کشتوکاڵ مەبن راتاندەگوازین.

لە ناوچەی پشدەر چوار ئۆردوگای دامەزراند، کە بریتی بوون لە:

- ئۆردوگای تووە سوران.
- ئۆردوگای بەستەستێن.
- ئۆردوگای ژاراوە.
- ئۆردوگای پێماڵك.

هەر کۆمەڵە خانوویەکی دا بە بەڵێندەرێك و، ئەندازیارێکی عەسکەری بە ناوی **رائد بەکر** سەرپەرشتی دەکرد و بەشی عەسکەریش چاودێر بوو. لەم قۆناغەدا جگە لە چەند گوندێکی دەوری شار نەبێت گشت گوندەکانی سنووری پشدەری چۆڵ کرد. خەڵکەکەی بەبێ ئیشوکار لە ئۆردوگاکان کۆکردەوە. خەڵکێکی زۆریش لە فەرمانگە و بەرێوەبەرایەتیەکان دامەزران. درەختە بەردارەکانی سوتاند یان بڕی، لە بری ئەوە داری بێبەری وەك سنەوبەری بۆ مەبەستی تایبەتی لە چەند شوێن چەقاند. بە ژمارەی دارسنەوبەرەکانیش کرێکاری دامەزراند گوایە خزمەتیان بکەن.

ئینجا پیاوانی رژێم لەم خەڵکە وەخۆکەوتن، دەیانکردن بە ئەمن و ئیستخبارات و سیخوڕ لەسەر یەکتری. هەروەها دەستیان کرد بە نانەوەی ئاژاوە و دوژمنایەتی لە نێوان خەڵکەکە، تا ناچاربن چەك بۆ رژێم هەڵگرن. ئەمانە هەر یەکەم ساڵیان خۆش بوو تا پارەی تەعویزیان مابوو. بازنەی دەرچوون لە دەرەوەی شار تەنگتر بۆوە. رووت لە هەر شوێنێك دەکرد کرابوو بە ناوچەی محەڕەمە. هەرکەسێکیان لە ناوچانە دیبا دەیانکوشت. کەس بۆی نەبوو بچێتە دەرەوەی شار.

رۆژێک چەند گوندنشینێکی گوندی بێگەڵاس بە شەو چووبوون بۆ گوندەکەیان بۆ ئاودانکردنەوەی باغ و رەزەکانیان، بەو ئاواتەی رۆژێ لە رۆژان بگەڕێنەوە. لە رۆژی ١٩٩٨٠/٥/١٧ لە کاتی گەڕانەوەیان لە رەبایە بەرزەکانی عەسکەریە چاوییان پێیان کەوتبوو و، هاتنە سەر رێگایان و لە دەشتی گوندی **شۆڕان** گشتیان بە ئەسیری گیران و هەر لە و شوێنە بە دیلی شەهیدیان کردن....

| **ناوی شەهیدکراوەکان** | **ساڵی لەدایکبوونیان** |
|---|---|
| • حەسەن حەمە حەسەن | ١٩٦٠ |
| • مەحمود حاجی رەسوڵ | ١٩٦٠ |
| • عومەر عەبدوڵا ئەحمەد | ١٩٥٥ |
| • حەسەن حەمەد وسو | ١٩٦٤ |
| • شەخسە حەمە وسو | ١٩٤٢ |
| • ئەحمەد عەبدوڵا مینە | ١٩٥٨ |
| • حوسێن رەسوڵ حەسەن | ١٩٥٧ |
| • ئیبراهیم حەمەد رسوڵ | ١٩٧٠ |
| • حەمەد رەسوڵ حەمەد | |
| • خدر عەبدوڵا مینە | |

خدر عەبدوڵا مینە برینداربوو بەڵام لە ناو شەهیدەکان خۆی کرد بوو بە مردوو. هەرچەندە بێگەڵاسیەکان لە بغدا شکاتیان لەو ئەفسەرە کرد کە ئەم تاوانەی ئەنجامدابوو، دوو کەسیش بە ناوەکانی حەسەن سلێمان و برایم سۆفی مینە لەسەری شاهید بوون، بەڵام هیچیان بۆ نەکرا. خۆزگە ئەم تاوانبارە بێ دین وو بێ ویژدانە



بناسرابایەوە و بدرابا بە دادگای تاوان. من پێم وایە ئێستاش ئەگەر ئیشی لەسەر بکەن ئەم تاوانبارە دەدۆزرێتەوە...

رژێم بەنیاز بوو بۆ لەناوبردنی دانیشتوانی ناوچەکە، لە ساڵانی داهاتوودا زیاتر درێژەی بە راگواستن بدات. بەڵام بە هوی ئەوهێرشەی کردیە سەر دەوڵەتی ئێران بەرنامەکەی لێ تێکچوو. تووشی شەڕێکی ٨ ساڵە بوو، لەبەرئەوە بە شێوەی کاتی دەستی لە راگواستن هەڵگرت. هەقە لێرەش دا ئەمە بخەمە روو، باوکم کاتبی دادگای قەڵادزە بوو. خانەنشین بوو عەریزە نووسی دەکرد. رۆژێک لای دانیشتبوم دوو موختار هاتنە لای باوکم کە بە ناوی گوندەکەوە تۆمارێکیان بۆ بنووسێ تا ئەوانیش راگوێزن لەو ترسەی گوایە پێشمەرگە هەراسانی کردوون و ناتوانن ئەوەندە خزمەتی پێشمەرگە بکەن. باوکم زۆر ئامۆژگاری کردن هیچ سودی نەبوو. سەرئەنجام داواکەیان پێ نووسی.

## پشدەر لە کاتی جەنگی عێراق و ئێران دا

پشدەر لەم جەنگەدا بووە بەرەیەکی گەرمی شەڕی بەربڵاو. سەرتاسەری ئەو دەڤەرە بوو بە سەربازگە و تۆپخانەی عێراق. لەم سەربازگایەنەوە بە تۆپی قورس و کاتیۆشا تۆپ بارانی ئێران دەکرا. ئێرانیش بە هەمان شێوە تۆپبارانی ناوچەکەی دەکرد.

ماوەیەك پشدەر لەبەرئەوەی بەشێك لە ناوچەکانی کوردستانی رۆژهەڵات لە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئێراندا نەبوو، ئێران دەستی نەدەگەیشتە ئەو سنوورانە، لە گێژاوی ئەم جەنگە دوور بوو. دوای ماوەیەك رژێمی ئێران کوردستانی داگیرکردەوەو هاتەوە سەردەشت موقابیل قەڵادزێ، بەڵام نەگەڕابۆوە سەر سنوور. لە نیوە شەوێکدا کۆماندۆی لەشکری ئێران بە پێ رۆو بە دزییەوە خۆیان گەیاندە لووتکەی چیای **بڵفەت**. وەختێك خەڵکی ناوچەکە و حکومەتی عێراق پێیان زانی، سوپای ئێران لوتکەی چیای بڵفەتی گرتووە و خۆی قایم دەکات هەموو شت تەواو ببوو. ئەم لووتکە شاخە زۆر گرینگ و ستراتیجی بوو، بەسەر هەموو ناوچەکانی پشدەردا دەیڕوانی. ئیتر ترس و دڵەڕاوکێ باڵی کێشا بە سەر خەڵکی ناوچەکە و بەسەر حکومەتی عێراقدا. ئەو چیایەی بەرامبەر لوتکەی چیای بڵفەت بوو، بریتی بوو لە زنجیرە چیای **مامەندە** و دروست لە بواری سەربازی دا لەگەڵ بڵفەت بەرامبەر یەکبوون. لووتکەی مامەندە کە بەسەر ناوچەی شێنێ دا دەیڕوانی هێزی پێشمەرگەی یەکیەتی نیشتمانی لێ بوو. پێشمەرگە بێ دەنگ چۆڵی کردبوو. حکومەتی ئیراقیش  سەرکەوت و بێ شەر پایەگا و سەربازگەی لێ دانا. لە راستیدا ئەم کارە پێدەچوو بە تەنسیقێکی نهێنی کرابێ. هەرچەندە خەڵکانێك پێیان ناخۆش بوو، بەڵام وەك واقیع تا رادەیەك ناوچەکەی لە مەیدانی شەڕو پێکدادان دوور کردەوە و شەڕ زیاتر لە چیاکان بوو. هەندێك جار تەنسیق هەبوو لە نێوان پێشمەرگەی ناوچەکە و حکومەت کەلەم ناوچەیەدا پێشمەرگە چالاکی نەنوێنێ، لە بەرامبەریشدا حکومەت چاوپۆشی لە جموجوڵی پێشمەرگە دەکرد. سوپای عێراقی



شەو و رۆژ بێ ترس لە پێشمەرگە، هاتوچۆی دەکرد. ئەم رێککەوتنە بە **مفاوەزەی مەحەلی** ناو دەبرا، لەراستیدا بۆ خەڵکی ناوچەکە تارادەیەك باش بوو.

شاری قەڵادزێ لە نێوان دوو دوژمنی بێ بەزەیدا بوو. ئێران بە تۆپە قورسەکانی لە شارەکەی دەدا و خەڵکێکی زۆری لەو شارە شەهید و کەمئەندام کرد، بە تایبەتی کاتێك بۆردومانی شارەکە خەست و خۆڵ دەبوو. کە شەڕی شارەکان **(حرب المدن)** دەستی پێدەکرد، شارە سنووریەکان کەوتنە ژێر رەحمەتی تۆپبارانی دوژمن. ئێران لە شەڕی شارەکاندا لە بواری هێزی هەوایی بێ توانا بوو. فڕۆکەی ئێرانی نەیدەتوانی بێتە سەر شارە گەورەکانی عێراق، بۆیە زیاتر بە تۆپباران کردنی شارەکان وەڵامی دەدایەوە. تۆپەکانیش تەنیا دەگەیشتنە شارە سنوریەکان و زۆر بێ بەزەییانە بە تۆپی قورس راست و چەپ شارەکانی دەکوتا و خەڵکی بێ گوناهی شەهید دەکرد. خەڵکی شاری قەڵادزێ ناچار دەبوون بەشێوەی کاتی شارەکەیان بەجێ بهێڵن و بچنە رانیە یان سەنگەسەر. کە شەڕ رادەوەستا دەگەڕانەوە قەڵادزێ. ئەم کارە ساڵی چەند جار دووبارە دەبۆوە. رۆژێك نەبوو خەڵکی ناو بازاڕ بە ماراسۆن رانەکەنە ناو حەشارگەکان یان ئەو شوێنە قایمانەی تۆپ کاری لێ نەدەکرد. ئەو کاتە ئەو کەسە بەبەختەوەر دادەنرا کە حەشارگە یان ژێر زەمینێکی باشی هەبوایە کە هەم خۆی تێیدا بشارێتەوە و هەم میوانداری ئەو خەڵکە بکات کە روو لە حەشارگەیماڵەکەی دەکەن.

بە درێژایی شەڕی ئێران و عێراق کە هەشت ساڵی خایاند، راکردن و خۆ حەشاردان لە ژێر زەمین و راکردن و سوتان و گرتن و کوشتن و بڕین بۆ ئێمەی خەڵکی قەڵادزێ بەردەوام بوو. بەردەوام تۆپ باران بوو. بە هۆی بڕینی تەلی کارەبا زۆر جار چەند رۆژێك یان چەند کاتژمێرێك بێ رووناکی دەبووین. سەرەڕای ئەم هەموو ناخۆشییەش، ئێمە رازی بوین تەنها لە وڵات و ناوچەی خۆمان بمێنینەوە.

ئێران لە بەرەکانی جەنگ پێشڕەوی دەکرد. سات بە سات نزیك دەبۆوە. خەڵکی پشدەر زۆر دەترسان لەم جەنگەدا بکەونە ناو جەرگەی جەنگەکە و تووشی کارەسات بن، بە پێشڕەوی ئێران خەڵك دەترسان تووشی کیمیاباران بن، کەچی خەڵك هەر

ئامادە نەبوون ئەم شارە چۆڵ بکەن. شار هەموو شتێکی لەخۆگرتبوو، هەموو ماڵێك ئامادە باشی خۆی کرد بوو بۆ خۆپاراستن لە چەکی کیمیایی. نایلۆنیان بەدەرگا و پەنجەرەوە گرتبوو. تێکڕا دەمامکی دەستکردییان بۆ هەموو خێزانەکەیان دروستکردبوو. خەڵووزی کوتراویان لە شێوەی دەمامك خستبووە ناو تورەگەیەك بۆ داپۆشینی دەموچاو. ڕێنماییەکانی خۆپاراستن لە چەکی کیمیاییان نووسیبۆوە و دەیاندا بە یەکتری و لەبەریان دەکرد تا هەمووان بزانن چۆن خۆ لەم چەکە دەپارێزن. خەڵکەکە ناخۆشی و دەردەسەری قبوڵ بوو بەومەرجەی بمێننەوە لە ناوچەکە رانەگوێزرێن.

سەیر ئەوەبوو خەڵکەکە بە هەموو شێوەیەك حەزی دەکرد ئێران سەرکەوێ و عێراق تێکبشکێ. تۆپی ئێران شارەکەی وێران و کاول کرد بوو، بەڵام کەس قسەی خراپی بە ئێران نەدەگوت. گشت خەڵکەکە جنێویان بە رژێمی عێراق دەدا. تۆپی ئێران شارەکەی وێران دەکرد بەڵام خەڵکەکە لە داخی رژێمی بەعس خۆیان بە قوربانی ئێران دەکرد. گوێیان لە ئیزگەی ئێران دەگرت بەهەر سەرکەوتنێکی ئێران خۆشحاڵ دەبوون.

کەس بیری لەوە نەدەکردەوە شارەکە چۆڵ بکات. پێیان وابوو لەبەر ئەوەی شارەکە خۆڕاگر بووە لەم جەنگە رزگارمان بێت حکومەتی عێراق ڕێز لە خەڵکی شارەکە دەگرێت.

زۆرجار لەو کاتەدا کە تۆپبارانی ئێران خەست دەبوو، عێراقیش رووی تۆپەکانی لە قەڵادزێ دەکرد و بە دزی دەستی بە تۆپ بارانی شارەکە دەکرد. خەڵك بەم کارەیان زانی و کردیان بە قاو و هاوارییان لێ پەیدا بوو:

ـ عێراق خۆی تۆپبارانمان دەکات بوو بە وێردی سەر زمانی خەڵك .

دائیرەی ئەمن ئەم قسە و باسەی زانییەوە لە دوای موختارەکانی قەڵادزێی نارد. رۆژێك کاتژمێر (١٠) دەی پێش نیوەڕۆ لە دووکانی **حاجی زاهیری رەسام** دانیشتبووین، **من و مەلا خدر نەجمەدین و پیرۆت کەردز**. لەو کاتەدا پیرۆتی مەمەندی موختار ومەلا عوسمانی موختار لە دائیرەی ئەمنەوە دەهاتنە خوارەوە.



مەلا خدر بانگی کردن گوتی موختارینە وەرن بزانم لە کوێ بوون!؟ موختارەکان قسەیان لە کاك مەلا خدر قبوڵ دەکرد و رێزیان دەگرت.

ـ دانیشتن گێڕایانەوە، گوتی: **مدیر ئەمن ومەسئول منەزەمە** بانگیان کردین و وتیان: بیستومانە خەڵك پڕوپاگەندەی خراپ دژ بە حکومەت دەکەن، گوایە عێراق بۆردوومانی قەڵادزێ دەکات. ئێوە موختارن بڕۆن قسە بۆ خەڵك بکەن. ئێمە چۆن لە هاوولاتی خۆمان دەدەین. ئەو خەڵکە کەسوکاری ئێمەن. قیادە، بۆ خۆڕاگری قەڵادزێ بەرامبەر بە (فاو) حساب دەکات. دەبێ دوای جەنگ تەقدیر بکرێن و پاداشتتان بدرێتەوە. مەلا عوسمان گوتی:

ـ ئێمەش پێمان وتن ئێوە راست دەکەن و ئەو خەڵکە بەکەسی خۆتان دەزانن. ئەم خەڵکە درۆ دەکات، بەڵام ئێمە قسە بۆ خەڵك بکەین کەس گوێمان لێ ناگرێت بە پیاوی ئێوەمان دەزانن. قوربان هەتیوە سەر رووتی وا پەیدا بووە وەك شەیتان وایە، لەگەڵ تۆپباران دەست پێ دەکات، لە باتی ئەوەی خۆی بشارێتەوە، دەچێت سەیری بروسکەی تۆپەکە دەکات تا بزانێ لە کوێ بروسکەکەی دێت، بە کاتژمێری دەستیان دووری بروسکەی تۆپەکە حساب دەکەن و، کاتێك کە بەرەو شار دێت دەڵێن تۆپی عەیار (١٣٥) یان (١٥٥)ە و لە فلان سەربازگەی ئێرانەوە دێت و ئەوەندە لە شار دوورە. دەڵێن ئەو تۆپەی لە شارەکە دەدات نزیکە. بروسکەی تۆپەکە لە فلان سەربازگەی عێراقیەوە دێت تۆپی و ئێران زۆر لەوە دوورترە. هەروەها گوتی:

ـ پێم گوت جەناب بە خوا گاڵتە بە ئێمە دەکەن و، کەس باوەڕ بە ئێمە ناکات. گوتی کە قسەکەم کرد مەسئول منەزەمە سەیری مدیر ئەمنی کرد وەك پێی بڵێ دزیەکەمان ئاشکرا بوو. خوا کردی لەوکاتەوە عێراق وازی لە تۆپبارانی دەڤەرەکە هێنا.

دزی و راوو رووت، ببوو بە پیشەی پیاوانی رژێم. هەرکەسێك پارەی هەبوایە دەبوو پارچە چەکێك پەیدا بکات نەك شەو بگەنە سەری و پارەی لێ بستێنن. دوکان بڕینی شار پیشەی شەوانەیان بوو. شەو نەبوو چەند دوکانێك نەبڕدرێت. بەیانیەك هەڵسام بینیم نۆ قاسەی گەورەیان لەبەر دەرگای ئێمە فڕێداوە. نۆ دوکانی

زێڕنگەری لێ بوو هەموویان بڕی بوون. خەڵك بینیبووی جاشەکان بە ئاشکرا بە سەیارەی شۆفەرلێت ئەم دزییەیان کردووە، بەڵام کەس نەیدەوێرا قسە بکات. بەم کارانە گوزەرانیان لە خەڵك تاڵ کرد.

پیاو ماقولاّن بە دزی خەڵکیان ئاگادار کردەوە کە ئێوارە دوکانەکان چۆڵ بکەن و کەلوپەلەکان ببەنەوە ماڵێ. ئینجا ئێواران عارەبانە و سەیارە بەرنەدەکەوت و دوکانەکان چۆڵ دەکران. حکومەت زانی خەڵك دوکانەکانیان چۆڵ کردووە لە دوای خەڵکەکەی نارد، خەڵکەکەش پێیانگوتن:

ـ لە ترسی دزی چۆڵی دەکەین.

ئینجا حکومەت داوای لە خەڵك کرد دوکانەکان بکەنەوە. ئەوانیش دوکانەکانیان ئاوەدان کردەوە. بەڵام حکومەت پاراستنی دوکان و بازاری هەر بەو جاشانەی سپارد کە دزیەکانیان دەکرد. بەم شێوەیە پرۆسەی دووکان برینیش کۆتایی هات...

شتێکی تر هەبوو لە تۆپباران ناخۆشتر. ئەویش شەڕی جاش و ئینزیباتی عەسکەری بوو لە ناوشار. کەم ڕۆژ هەبوو نەبێتە تەققە و جاش و ئینزیبیات لە ناو بازاڕ یەکتری نەکوژن. قائید فیرقەی عەسکەری ئەمری دەرکردبوو نابێ هیچ جاشێك لە ناو بازار چەکی پێ بێت. کە ئینزیباتی عەسکەری تووشی جاش دەبوون، چەکیان دەکردن و ئیتر دەبوو بە شەڕەتفەنگ. بەم شێوەیە جاش و ئینزیبات ببوونە دو منی یەکتری. لەو سەردەمەشدا جاشەکان نەیاندەوێرا بە بێ چەك بگەڕێن چونکە ڕژیم ئەوانیشی لەیەکتری کردبوو بە دوژمن. بۆیە جاشەکان دەبوایە لە ترسی یەکتری بەردەوام چەکیان پێ بێ. بەم هۆیەوە بە دەیان عەسکەری و جاش ئینزیبیات لە بازاڕی قەڵادزێ کوژران. هەر کە بازار دەشێوا، خەڵك بە ماراسۆن بەرەو ماڵ دەبۆوە و بازاڕی بەجێدەهێشت. کەس فریای دوکان داخستن نەدەکەوت. ئنجا عەسکەری و ئیستخبارات بەردەبوونە گیانی خەڵکی بێ تاوان، بگرە و لێدە. زۆر جار جاشی شارەکانی تر لەبەر ئەوەی ئاگایان لەم بر یارە نەبوو، کە دهاتن بۆ دەڤەری چشدەر تووشی ئەم کیشەیە دەبوون.

ڕۆژێك جاشێك بە ناوی **حوسێنە سوری عەبدولاّی مستە فارەش**، لە نەقلیاتی ئۆردوگا چەکی پێدەبێ، ئینزیباتێك داوای چەکی لێ دەکا. جاشەکە زۆر دەپاڕێتەوە



وازی لێ بهێنێت و بڕوا. کەچی ئینزیباتەکە نایسەلمێنێ، چەك دادەگریت دەسرێژی لێبکات، بەڵام جاشەکە زووتر دێتە دەست و ئینزیباتەکە دەکوژێت. یەکسەر دوای ڕووداوەکە عەسکەری دابەزی و بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە(٥٠) پەنجا دوکانی سوتاند و زیاتر لە (١٧) حەڤدە سەیارە و هەرچی عارەبانەی حەماڵی و بەقاڵی ئەو ناوە هەبوو، هەموو سوتاند. هەرچەندە خەڵك هاواری دەکرد فلاّن جاش بووە پیاوی حکومەت بووە، بەڵام بێ سوود بوو.

سەیر ئەوە بوو چەند دووکاندارم بینی کە دوکانیان سووتا بوو، دەیانگوت قەیناکە دووکانمان سوتاوە مادام جاشەکە ئینزیباتەکەی کوشتووە، دەستی خۆش بێ. هەرچەندە ڕژێم بۆ گرتنی جاشەکە دەوری شاری گرت بەڵام پیاوانە دەرباز بوو.

لە سالاّنی دوایی جەنگی عێراق و ئێران بڕیاری ٣٦ و٣٧ مدیریەتی تەجنیدی عامە ٧ موالیدی بەیەکەوە بۆ سەربازی داوا کرد. کەس نەمایەوە سەربازی شمولی نەکات. هەموو شوێنێك پڕ بوو لە سەربازی راکردوو. هێزی پێشمەرگەش لێیان بێزار بوون چونکە کەمیان دەبوونە پێشمەرگە. زۆربەیان لەگەڵ جاشەکانبە نیوانو نیوی مووچە ڕێك دەکەوتن، واتە بۆ جاشایەتی ناونووس بکەن بە بێ ئەوی هیچ ئەرکێك لە ئەستۆ بگرن ، بەڵام نیوەی مووچەکەیان بۆ سەرۆك جاشەکە بێت. وەك واقع ئەو جاشایەتییە گەنجی کوردی لە کوژران و لە شەڕی نێوان ئیڕاق و ئێران زۆر پاراست. ڕۆژێك لەگەڵ **عەلی حاجی خدر چنارنەیی** بە پێ بە ڕێگای قاچاغدا دەچووین بۆ ژاراوە. گوێدرێژێك لە هەوای خۆی دەیزەڕاند. عەلی رووی کردە گوێدرێژەکە وگوتی خۆزگەم بە خۆت!، بزەڕێنە، وەك من موالیدنی لە هیچ شوێنێك جێگات نەبێتەوە!.

ڕژێم لەو ڕۆژەوە بەدواوە لیژنەی ئەمنی دروست کرد. سەرۆکی لیژنەکە **مقدم غازی** بوو. ئەو نەقڵ بوو **مقدم سلێمان** هاتە شوێنی. مەسئول منەزەمە **کە** ناوی **موئەیەد** بوو، لەگەڵ زابتی ئیستخبارات و **مدیری ئەمن ملازم حەمید** دوای ئەو **ملازم جاسم** هاتە شوێنی، ئەوانە ئەندامی لیژنەی ئەمنی قەڵادزێ بوون.

لە سەردەمی جەنگەکەدا قائید فیرقەیەکی لێ بوو ناوی **عبدالعزیز حدیثی** بوو. خەڵکی پشدەر ناویان نابوو **قائیدە شێتە**. زۆر خراپ بوو خەڵك زۆر لێی دەترسان. تووشی

هەر کەسێك بووایە لە پشت جادەی ٦٠ شەستی، واتە ئەو جادەی دەوری شاری داوە، یەکسەر دەیگرتی و دەیبرد. ڕۆژانە چەندجار بەم جادەیەدا هاتوچۆی دەکردو سەری لە بەرەکانی شەڕ دەدا. خەڵکی تەواو بێزار کرد بوو. کەس نەیدەتوانی لە سنووری شارەوانی بچێتە دەرەوە بارەگیایەك بهێنی. دەیانگوت شیعەیە بۆیە وا دەکات تا خەڵك لە ڕژێم بێزار بێت. خەڵکی وەك کارەگەل لە کۆزێ کرد بوو.

ڕۆژێك جەماعەتێك دانیشتبوون بۆ خواردنەوە، نەفەرێکیان چوو بوو لەسەر جادەی ٦٠ شەست مەتری دانیشتبوو بۆ پێشاو، برادەرەکانی دەنگیان دا بوو بۆ لەسەر جادەی گشتیە پێشاو دەکەی، گوتبووی:

ـ ئەی لە کوێ دانیشم؟ بەرجادە و پشت جادە هەموو **محەڕەمەیە!**

خوا کردی قائیدە شێتە لە دەشتی کۆیە لە فڕۆکە کەوتە خوارەوە و مرد. بوو بەقاو گوایە بە پیلان لە ناویان بردووە...

ئێران لەهەموو بەرەکانی جەنگ لە پێش ڕەویدا بوو. لە زۆربەی بەرەکانی شەڕ دەهاتە ناو خاکی عێراق. **مەحمودی حاجی حەمەرەش** چەند مانگێك پێش کارەساتی **هەڵەبجە**، ڕۆژێك لە مزگەوتی گەورەوە تەلەفۆنی بۆ کردم، گوتی: تا حوجرە وەرە ئیشم پێتە. منیش چووم بەیەکەوە ماوەیەك دانیشتین زۆر قسەی بۆ کردم گوتی ڕەنگە ناوچەکەی ئێمەش بکەوێتە ناو گێژاوی جەنگ، شتێك هەیە پێم باشە ئاگادار بیت و سەرێش ئاگادار بکەی. گوتم: چییە؟

ـ گوتی ئێران داوای هاوکاری کردووە لە خەڵکی ناوچەکە و دەیەوێت دەست بەسەر ناوچەی پشدەردا بگرێت. گوتی ئێستا ئیشی لەسەر دەکرێت و، بۆ ئەم مەبەستەش مەلا دەڵگەیی چووە بۆ دۆڵی **سەفرە**. گوتی لەم ڕۆژانەدا چی هەبوو ئاگادارت دەکەم. وتی ئەگەر منیشت نەدیت کاك **سمایلی حاجی قادر** ببینە قسەت بۆ دەکات، ئەویش ئاگادارە. کاك **مەحمود** لە قسەکانیدا وا خۆی نیشاندا پێی خۆش نییە و دەترسێ کارەسات ڕووبدات.



## خۆپیشاندانی ١٩٨٢/٤/٢٤

دوای بۆردوومانەکەی ١٩٧٤/٤/٢٤ یادی ئەم کارەساتە بوو بە نەریتێکی ساڵانەی خەڵکی **قەڵادزێ**. لەم ڕۆژەدا خەڵکێکی زۆر لە شارەکانەوە دەهاتن. هەر لە کەسوکاری شەهیدانەوە بگرە تا دەگاتە دۆستانی قوتابیانی زانکۆ. دەچوون بۆ سەر مەزاری شەهیدان. بەڵام ئەو ساڵە واتە ساڵی **١٩٨٢** بارودۆخی عێراق بە گشتی و کوردستان بە تایبەتی گۆڕابوو. عێراق کەوتبووە ناوجەنگێکی گەورە لەگەڵ ئێران و، بە هەزاران سەربازی ڕاکردوو لە ناوچەکە داگیرسابوونەوە. ڕژێم بە باشی نەدەزانی دەستیان بۆ درێژ بکات. لەو سەروبەندەدا ڕێکخستنی حزبەکان لە ناو شار لە جار ان چالاکتر بوون. لە هەموو ڕوویەکەوە زەمینە لە باربوو. و خەڵکێکی زۆر ئامادەی ئەم یادەوەریە بوون. پۆستەری شەهیدەکان و بەیاننامەی حیزبەکان زۆر بڵاوکرابۆوە و یادەوەرییەکە شێوەی خۆپێشاندنی وەخۆ گرتبوو. ڕژێم ویستی بەزەبری هێز بڵاوەیان پێ بکات. لە ئەنجامدا تێکهەڵچوون ڕوویدا. ڕژێم بە تەقەکردن ویستی بیانترسێنێت. بەڵام خەڵکەکە بە وتاف کێشان وەڵامیان دایەوە و، هێرشیان کردە سەر پیاوانی ڕژێم ویستیان چەکیان بکەن. ئەمجارە لە هەرچوار لاوە کرا بە تەقە و، لە ڕەبایەکانی سەر **گردی حوسنی** و **گردی والی بەگ** و ڕەبایەی **قەڵاتەوە** عەسکەری دابەزی تا خۆپێشاندەران دەسگیر بکات. ئەوانیش بە بەردەفڕکە ڕووبەڕووی سەرپیاوانی ڕژێم بوونەوە. تا یدەهات ژمارەی سەربزەکان زۆرتر دەبوو. خەڵکەکە لە ترسی ئەوەی نەگیرێن، لە هەورازی سەر قەبران خۆیان فڕێدایە خوارەوە و خۆیان بە چۆمەکەدادا. وەرزی بەهار بوو، چۆمەکە زۆر بوو، هەموو کەس نەیدەتوانی بپەڕێتەوە، لەبەرئەوە هاوکاری یەکتریان دەکرد. کچ و کوڕ دەستی یەکتریان دەگرت بۆ پەڕینەوە لە چۆمەکە. بەڵام **دایکە ئامینە** و **خوشکە سنەوبەر** لە چۆمەکەدا خنکان و شەهید بوون. لەم خۆپێشاندانەدا **عومەر خدر نوورەدین** بریندار بوو و، پتر لە (٦٥) شەست و پێنج کچ و کوڕی خۆپێشاندەڕ گیران. زۆربەی خۆپێشاندەران پەنایان برد گوندی **بنەوشان**. لە ماڵێ **شێخ حوسێن** ی بنەوشان گیرسانەوەو، خواهەڵناگرێ ئەوانیش داڵدەیان دان، زۆر خزمەتیان کردن، جلوبەرگی وشکیان پێدان پاراستیانن. دوابەدوای ئەوە خەڵکی

شارەکە هەڵوێستیان وەرگرت. دوکان و بازاڕ و دائیرەکانیان داخست و هاتن بۆ **مزگەوتی کارەبا** کە تەرمی دوو شەهیدەکە لێ دانرا بوو. بە بڕیاری خەڵك و مەلاکان هەردوو شەهید بە ئەمانەت لە حەوشەی مزگەوت نێژران. **مەلا محەمەد ئەمینی** مام قاسمە بە ئەمانەت تەلقینی دان. پەشێویەکە گەورەتر بوو و زۆر لە ڕێکخستنی حیزبەکان خۆیان ئاشکرا کرد. بۆ نموونە مەفرەزەیەکی حیزبی شیوعی بە سەرپەرشتی **مستەفا غەفور** لە شاخەوە خۆی گەیاندە ناو خەڵك و بە ئاشکرا قسەی لەگەڵ خەڵك کرد. خۆپێشاندان تەشەنەی کرد و کار گەیشتە رادەی راپەڕین. یەکەم شار **رانیە** بوو پشتیوانی خەڵکی قەڵادزێی کرد. ئەوانیش راپەڕین و شەهیدیان دا. دواتر خۆپێشاندان زۆربەی شارەکانی کوردستانی گرتەوە. ئەم بارودۆخە ماوەی (٥) پێنج رۆژی خایاند. بەڵام رژێم توانی راپەڕینەکە دامرکێنێ و بارودۆخەکە ئارام بکاتەوە. ئینجا وەك کەسایەتی ناوچەکە کەوتینە هەوڵدان بۆ بەردانی گیراوەکان. بەرەبەیانێك بە هەوڵی جەماوەر بەدزی تەرمی هەردوو شەهید لە حەوشەی مزگەوت دەرهێنرانەوە، گواسترانەوە بۆ گۆڕستان و لەوێ نێژران.

لە راستیدا هەموو حیزبەکان لەم راپەڕینەدا بەشدار بوون. بەڵام هەندێك لایەن دەستپێشخەرو چالاك تر بوون.

هەموو ساڵێك لەو رۆژەدا، رژێم پێش چەند رۆژێك بە زیادکردنی پیاوانی سەرکوتکەر و بڵاوکردنەوەیان لەو شوێنانەی شکی دەکرد خۆی ئامادە دەکرد بۆ سەرکوتکردنی هەرخۆپیشاندانێکی چاوەڕوانکراو. دانانی چەند زری پۆشێك لەبەردەم قووتابخانەکان و سەر گۆڕستانی شەهیدان و مزگەوتەکان تا لاوەکان بانگەوازی خۆنیشاندان و راپەڕین بڵاونەکەنەوە. سەرەڕای ئەم هەموو زەبروزەنگ و ئامادەکارییەی رژێم، لاوەکان بێ گوێدانە ترس و هەڕەشە ئەم رۆژەیان پیرۆز رادەگرت و یادیان دەکردەوە. کەم ساڵ هەبووە لەسەر ئەم یادکردنەوەیە چەند لاوێك لەم رۆژەدا تووشی گرتن و راوەدوونان نەبن. بەڵام دوای ئەوەی کوردستان ئازاد بوو حکومەت و پەرلەمانی کوردی هاتە مەیدان، لە جیاتی ئەوەی بە گەرموو گوڕتر یادی ئەم رۆژە بکرێتەوە، بە پێچەوانەوە نەك هەر یادی ناکرێتەوە، بەداخەوە وادیارە دەیانەوێ لە بیرخەڵکی بەرنەوە...!



## خۆپیشاندانی ١٩٨٢/٧/٤

لە رۆژی ٢٦ /١٩٨٢/٦ **شێرکۆی شێخ نوری** لە چایخانەی ناو بازاڕ، قوات خاصەیەکی کوشت و رایکرد. ئیستخبارات لە جیاتی ئەو **خاڵە قوبادی** لە ناو بازاڕ بەردەست کەوت و دەسگیری کرد...

بە داخەوە خاڵە قوباد لە رۆژی ١٩٨٢/٧/٤ لە ژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوو. خەڵك زۆر بۆی بە پەرۆش بوو چونکە کوڕێکی قسە خۆش، نیشتمان پەروەر و لەهەمانکاتدا بێ تاوان بوو. لە کاتی بە خاکسپاردنی خاڵە قوباددا تێکڕای خەڵکی قەڵادزێ ئامادە بوون. دوای بەخاکسپاردن خەڵکەکە بە خۆپیشاندان و وتاف کێشان و دەربڕینی دەنگی نارەزایەتی، بەرامبەر ئەم کردارە چەپەڵەی رژێم، بەرەو شار گەڕانەوە. ئەوانەی لەناو شار مابوونەوە بەدەنگ خۆپێشاندەرانەوە هاتن و خۆپێشاندانەکە گەورەتر بوو. رژێم کەوتە ئامادەباشی تەواو. بەم شێوەیە لەم شارەدا لە ماوەی (٣) سێ مانگدا بۆ جاری دووەم خەڵك دەستی کردەوە بە خۆ پیشاندان. خەڵك سامی شکا، گشت کات و ساتێك بیری لە راپەڕین و بە گژداچوونەوەی رژێمی دەکردەوە. چاوەڕێی هەلێکی دەکرد بۆی بڕەخسێ.

رۆژێك دوکانی غازفرۆشی **ئەحمەدی حاجی سابیر** تەقییەوە و ٢ منداڵ شەهید بوون. بەرێکەوت چەند گەنج لە سەرقەبران لەگەڵ **محەمەد رەنجاوی شاعیر** هاتن بۆ لام و وتیان ئەوە بە دەسکیسی حکومەت کراوە، با خەڵك تێبگەیەنین و بیکەین بە خۆپێشاندان. هەرچەند خەڵك چاوی کرابۆوە، بەڵام راپەڕین و خۆپێشاندان دەبێ هەلومەرجی تایبەتی خۆی بۆ بڕەخسێ...

## خۆپیشاندانی ساڵی ١٩٨٧ لە رەواندوز

رۆژی ١٩٨٧/٥/١٩ راپەڕینێکی گەورە لە شاری رەواندز دژی رژێم سەریهەڵدا. حیزبەکان پێیان وابوو دەبێتە راپەڕینێکی سەرتاسەری. قەڵادزێ هەمیشە دەستە چیلەی ئاگری شۆڕش و راپەڕین بووە. هەر بۆیە سەرکردایەتی حزبەکان دەستووریان بۆ رێکخستنەکانی ناو شاری قەڵادزێ نارد، بە زوویی هەمئاهەنگی بکەن و پشتیوانی ئەم راپەڕینە بکەن. بۆئەم مەبەستەش حزبەکان لەناو شار داوای تەنسیق کردنی رێکخستنەکانیان کرد، چونکە زۆربەی خەڵك و حزبەکان پێیانوا بوو ئەگەرتەنسیقێك هە بوایە لەناو رێکخستنەکانی شاردا ئەوا راپەڕینی ٢٤/٤ /١٩٨٢ وا بە ئاسانی کپ نەدەبۆوە. پێیان وابوو زەمینە لە بارە بۆ ئەوەی راپەڕینی شاری رەواندز ببێتە راپەڕینێکی سەرتاسەری کوردستان. رێکخستنەکانی ناو شار یەکترمان دەناسی. نوێنەری حیزبەکانمان دەستنیشان کرد بوو. بەڵام نەماندەزانی لە کوێ دابنیشین. هیچ کەس ئامادە نەبوو کۆبوونەوەکە لە ماڵی خۆی بێت. من ماڵی ئامۆزایەکەم دەستنیشان کردبە ناوی **ئەحمەد بەحری**. بە ئامۆزاکەم وت لە ماڵەوە شەڕم کردووە میوانیشم هەیە ئێوارێ میوانی تۆ دەبین. ئێوارە و دوای نانخواردن داوامان لێ کردن ژوورێکمان بۆ چۆڵ بکەن. تاوەکو بەیانی دانیشتین و قسەمان کرد و لە سەر چەند خاڵێکی گرینگ رێککەوتین و نووسیمان. هەرچەندە زۆر دەترساین بەڵام چارمان نەبوو. کاتێك هەڵساین کاك **سەعد** گوتی:

ـ با گەردنی یەکتر ئازاد بکەین لە موسڵ یەکتری دەبینینەوە.

کارێکی زۆر موجازەفە بوو کردمان کە لە ژێر سێبەری ئەم رژێمە دڕندەیە نوێنەری رێکخستنی (٤) چوار حزبی دژی رژێم لە ناوشار کۆببنەوە. خاوەنماڵ تا دوای راپەڕین نەیدەزانی ئەمە کۆبوونەوە بووە لە ماڵی ئەودا کراوە.

بەشدارانی کۆبوونەوەکە بریتی بوون لەم بەڕێزانە:



١. **حاکم مەمەند بایزاغا ــ** نوێنەری چەپەکان بە گشتی. ئێستا حاکمی ئەنجومەنی وەزیرانە.

٢. **عوسمان سێمان خدر (سەعد)** ـ نوێنەری سۆشیالیست. ئێستا کارگێڕی لقی ١١ی پارتی دیموکراتی کوردستانە.

٣. **مستەفا ئیبراهیم دەروێش** (شاسوار): نوێنەری یەکیەتی. شەهید بووە.

٤. **(من) ستاری حەمە تاهیر**(ئاراس): نوێنەری پارتی....

بەرنامەی کارکردنمان دانا کە چی بکەین. زۆر هەوڵماندا لەگەڵ گەنجان و قوتابیانی قوتابخانەکان و لایەنگری حزبەکان دا، بەڵام نەمانتوانی قەناعەت بە خەڵك بکەین کە مانگرتن و راپەڕین بکەین. دیارە زەمینە و کاتی گونجاو نەرەخسا بوو تا خەڵك بە گوێمان بکات.

دەپرسن ئەی شیوعیەکان، لە راستیدا شیوعیەکان ئاگادار کران، خەڵکی باشیان هەبوو لە ناو شار وپێیان خۆش بوو. دیار بوو بە گومان بوون لەم تەنسیق کردنە ئەوەندەیان وردکردبۆوە ترسیان لێ نیشتبوو. ناهەقیان نەبوو، باوڕیان بە من بوو لە رێگای (**هاوڕێ شەهید، جەمال حەسەن خدر ـ بەڕێوەبەری تاپۆی رانیە، خالید غەفوور**) راوبۆچوونی خۆیان بە من دەگوت. لە راستیدا ئێمەی پارتی، بارەگاکانمان وەك حزبەکانی تر نزیك شارنەبوو تا هەموو کات دەنگمان پێیان گەیشتبا. پارتی دوور بوو فریانەدەکەوتم پرس بکەم و بە بێ پرسی سەرووی خۆم بڕیارمدا، چونکە دوادەکەوتم و حزبەکەم بێ هەڵویست دەبوو. دوایی وەڵامم بۆ حزب نارد و دەستخۆشیان لێ کردم. کاتی کۆبوونەوەکە باس لە پارەو بوودجە کرا. من گوتم:

ـ ئێمە پارەمان هەیە ئامادەین سەرفی دەکەین. لە راستیدا برادەرانی سەرەوە لە مامەڵەکردنیان لەگەڵ ئێمە و هەلومەرجەکە هەندێك خەمساردی تێدابوو. ئێمە وەك رێکخستنەکانی ناوشار چاوەڕێی زۆر شتمان دەکرد، کەچی لەوە تێنەدەگەیشتین کە ئەوان بۆ ئاوا ساردن. بەڵام خەڵکی پارتی بە سەدان کیلۆمەتر

شاخ و داخی دەبڕی و خۆی دەگەیاندە سەرکردایەتی و بارەگاکانی پارتی. جگە لەوە ئەگەر رژێم بیزانیبا کەسێك هاوکاری پارتی دەکات وای بەحاڵی. لە لایەکی ترەوە ترسی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و یەکێتی نشتیمانی کوردستان هەبوو، کە نێوانیان لەگەڵ پارتی باش نەبوو. لە هەر لایەك پێشمەرگەی ئەوان لە سەر رێگەت بان دەگیرای و بەتۆمەتی نارەواش تاوانباریان دەرکردی و، وایان لە جەماوەری خۆشت دەگەیاند کە خیانەتت کردووە، تا ئەوانیش نەفرەتت لێ بکەن و گرتن و کوشتنت بە رەوا بزانن. جارێك چووم بۆ ئاڵوەتان لە گەرانەوەمدا حزبی دیموکراتی ئێران کەمینی بۆ دەرکردم بمگرن. لە **دەشتی مردواوێ** لای **ئازادی حاجی غەریب** لامدا نان بخۆم. ئازاد پێی گوتم دوو رۆژە پێشەرگەی دیموکرات لە تۆدەگەرێن. نان مەخۆ فریای خۆت بکەوە وخۆت رزگارکە. خۆم گەیاندە لای کاك رەسوڵ **مەمەند**. ئەویش بۆ پارێزگاریم تا **بەردقسڵ** دوو پێشمەرگەی لەگەڵ ناردم. لەو سەردەمەدا حالێ جەماوەری پارتی لەناو شار زۆرخراپ بوو...



## داستانی ئۆردوگای پێماڵك ناسراو بە (داستانی دووئەحمەد)

ئەم داستانە ناسراوە بە شەڕی قارەمانانەی **ئەحمەد حاجی محەمەد** و **ئەحمەد ئاودەل** لەگەڵ هێزەکانی رژێم. ئەم دووانە دوو پێشمەرگەی حیزبی سۆشیالیست بوون. هەر ناوێکی تریان لێ بنرێت ئەوا غەدریان لێ دەکرێت و راستی دەشێوێنن.

لە شاخ و لە ناو شۆڕش دەنگ بڵاوببۆوە کە حکومەتی عێراق خەڵکی ناردووە بۆ ناو شۆڕش تا چەك بکڕن و بۆ حکومەتی بهێننەوە. سەرکردایەتی حیزبی سۆشیالیست فەرمانی دەرکرد کە سەیتەڕە دانێن و ئەوەی چەکی پێ بوو بۆ خوارەوەی دەبرد لێی بستێنن و چەکەکەش بۆ خۆیان. ئەم پێشمەرگانە چەند چەکێکیان لە خەڵکی خۆشناوەتی گرت کە پێیان وا بوو بۆ خوارەوەی دەبەن. سەرکردایەتی سۆشیالیست ئاگاداری کردن کە چەکەکانیان بدەنەوە چونکە خزمی یەکێك لە سەرکردەکان بوون، بەڵام پێشمەرگەکان نەیانسەلماند و چەکەکانیان نەدایەوە و لە شۆڕش قاچاغ بوون و هاتنە خوارەوە بۆ ناو شار و چوونە ئۆردوگای پێماڵك. قاچاغ لە سۆشیالیست و لە رژێم. کێشەکەیان شەخسی بوو.

هەرشەوە لە شوێنێك و لە ماڵێك بە قاچاغی داڵدە دەدران. رژێم دەیزانی لە ناو ئۆردوگان. چاودێری دەکردن، تا بە تەواوی بزانن لە کوێن. ئەو دووکەسە جگە لە چاودێری رژێم کێشەیان لەگەڵ حیزبەکانیش هەبوو. سێبەری خۆیان لێ ببوو بە دوژمن. زۆر لە حیزبەکان لە رێگەی رێکخستنی ناوشار پەیوەندیان پێوە کردن. پارتی پەیوەندی پێوەکردن تا لە رێگەی دۆستێکیان بێنە ناو پارتی، بەڵام قبوڵیان نەکرد. دەیانگوت ئەگەر بێینە ناو پارتی دوور دەکەوینەوە و دەستمان ناگاتە ناو شار. مەبەستی تایبەتی خۆیان هەبوو نەك کێشە لەگەڵ شۆڕش. بەڵێنیان نەدا بچنە ناو هیچ حیزبێك. هەر چاوەڕێی ئەوەبوون سۆشیالیست وەریانبگرێتەوە. سۆشیالیستیش چەند مەرجێکی بۆ دانابوون کە جێبەجێیان بکەن ئنجا رێگەیان پێ دەدات بچنەوە ناو حیزب.

بەم شێوەیە لە ناو ئۆردوگا مانەوە تا لە ماڵی (حاجی مەحمودی باوکی یەك لـەم دووانە) ئاشکرا بوون. رژێم بە هێزێکەوە هاتە سەریان و گەمارۆی دان. چەند کاتژمێر لەگەڵ هێزێکی جاش و جەیشی شەعبی شـەڕیان کـرد. چـەند جـاش و عەسـکەریان کوشت. هێزەکەی رژێم ئاگریان لەو خانووە بەردا کەتێـدابوون. جگـە لـە گوللـەبارنی دۆشکە بە ئەندازەی ژمارەی بلۆکەکانی خانووەکە ئار. پی. ج یـان لـە خانووەکـەدا، کەچی ئەو شێرەکوردانە دەستیان هەر نەدا. عەسکەری و جاش وایانـدەزانی کـوژراون کە هێرشیان دەکردنە سەریان، ئەوان دەهاتنە دەست و هەر جـاش و عەسـکەر بـوون دەکوژران. دواتر شۆڤڵی عەسکەری هـات خانوەکـەیان بەسـەردا بروخینـێ، گوللەیـە کیان لە سەری سایەق شۆڤڵەکەدا و کوشتیان. چەند پێشمەرگەی تـر لـەناو ئۆردوگـا بوون زاتیان نەکرد لەسەریان بە جواب بێن. تا **ئەحمەدی حاجی مـەحمود** شـەهیدکراو **ئەحمەد ئاودەڵ**یش دوای ئەوەی فیشەکی نەما گیرا و دواتر لە موسڵ شەهید کرا.

دوایی کارەساتەکە حیزبـەکان بۆیـان دەگریـان و هێنـدێکیان بەشـەهیدی خۆیـان لەقەڵەم دەدان. من شاهیدی دەدەم کە هەر ناوێکیان لێ بنـێن غـەدریان لێ دەکـەن. ئەم دوو کەسە بە سۆشیالیستی شەهید بوون و تاکو شەهید بوون هەرچاویان لەوە بوو بگەڕێنە وە ناو حزبی سۆشیالیست.

جێگەی داخە دەیان پێشمەرگە و کادیری ئـاوا ئـازا و چـالاك لـە ناوچـە کـە هەڵکـەوتبوون، کەچـی حزبـەکان لەبـەر دووبـەرەکی و کێـشەی نێـوان خۆیـان، نەیانتوانی باش پەروەردەیان بکەن. ئەوانیش لە داخان دەهاتنەوە و زۆربـەیان بـە ناچاری دەبوون بەجاش.



## ڕاگواستنی بەستەستێن ١٩٨١/٥/١٣ بەرامبەر ٢٦ی مانگی ڕەمەزان

ئۆردوگـای بەستەسـتێن لـە دووهـەمین شـالاوی ڕاگواسـتن لـە هـاوینی ١٩٧٨ دروستکرا. بە دەیان گوندی ناوچەکەی تیادا کۆکردبۆوە. شوێنێکی ووشك و بەردەڵێن (بەست) بوو. زەوی کشتوکاڵی و هیچ سەرچاوەیەکی ژیانی لێ نەبوو. خەڵکەکە ناچار بوون پەنا بەرنە بەر قاچاخچیەتی. هەرچی زۆر قاچـاغ بـوو ئـەم خەڵکـە دەیکـڕی و دەیفرۆشت. چ جۆرە چەکێکی قورست بوویـستایە لـەم ئۆردووگایـە هـەبوو. چـەندان عەرەبی شیعە لە ڕێگای ئەم ئۆردووگایەوە لەدست ڕژێم دەرباز بوون خۆیـان گەیانـدە ئێران. بەردەوام مەفرەزەی پێشمەرگە لە نـاو ئـەم ئۆردووگایـە دەبینـرا. شـەوانە بـە سەدان بار ئازووقە دەچوو بۆ پێشمەرگە و بۆ ئێران. زۆر سەربازی ڕاکردووی کورد لەم ئۆردووگایە گیرسابوونەوە. قاچاخ چیەتییان دەکرد بێ ئەوەی لە کەس بترسن.

ئەمانـە بـە هـۆی جاشـەکان بـە سـەیارە هاوکـاری ئاسـانکردنی هاتوچـۆی پێشمەرگەیان دەکرد. هەر کەسێك لە ڕژێم قاچاخ بوایە گەیشتبایە ئەم ئۆردووگایە ئازاد دەبوو و نەدەگیرا. لە ڕاستیدا ڕژێم دەیتوانی دەسبەرسەر ئۆردوگاکـەدابکرێت یان کۆنترۆڵی بکات، بەڵام نەیدەویست گوشاریان بخاتە سەر و ناچاریان بکات بـڕۆن بینە پێشمەرگە. ئـەم بارودۆخـە گەیـشتە ڕادەیـەك سـەربازانی پێگـەکانی دەوری ئۆردووگاکە هەموویان فێری قاچاخ چیەتی بوون. بـە ئیڤـای عەسـکەری (چـایان) دەهێنا و بەڕێ دەکرا. ڕۆژێك قائید فرقە لە قوتابخانـە خـەڵکی کـۆکردەوە و داوای کرد واز لە قاچاخچییەتی بێنن ، **حەمەی کاك خدر مامەش** هەستا و گوتی:

ـ تا سەربازەکانی جەنابت بیهێنن ئێمەش لێ یان دەکڕین. ئەی ئەم خەڵکە بەچی بژی؟. قائید فرقە بوێری و ئەم وتە ڕاست و ڕەوانەی کاکە حەمەی زۆر پێ خۆش بوو. بە کورتی ڕژێم زۆر هەوڵی ئەوەی دا خەڵك واز لە قاچاخچییەتی بهێنن بەڵام سـوودی نەبوو. بە ڕاستی خەڵك زیادەڕەوەی دەکرد. بەهانەی دەدایە دەست ڕژێم.

لـە ڕۆژی ١٠/١٢/١٩٧٩دانیـشتوانی بەستەسـتێن دژی ڕژێـم ڕاپـەڕین. ڕێگـای سەرەکی ڕانیە قەڵادزێ یان گرت. ڕژێـم بـە هێـزی عەسـکەری هـات و ڕێگایەکـەی

کردەوە، زەلامێکی لێ شەهیدکردن بە ناوی **عەزیزی حاجی ئەحمەدی شۆڕان** کە موالید **١٩٥٢** بوو، وە چەند کەسێکیش بریندار بوون.

ڕژێم زۆر ڕێگەی گرتەبەر، بە دەوری ئۆردوگاکەدا چاڵی گەورەی هەڵکەند و پڕی کرد لە ئاو و تەلی دڕکاوی، ئەمەش چاری نەکرد. چەند ڕەبایەیەکی لە دەوری ئۆردوگا دانا بەوەش چاری بۆ نەکرا. کەمینی عەسکەری بە شەو دەردەچوو لە قاچاخ چیەکانی دەداو دەیکوشتن. بە دەیان خەڵك کوژران. بەوەش خەڵك وازیان نەهێنا. سەدان جاشی لێ بوو بە ڕۆژ جاش بوون و بە شەو دەبوونە قاچاخ چی و ڕێ نیشاندەری پێشمەرگە. قاچاخ چیەکان جاشەکانیان بەکرێ دەگرت و بۆ هەر وولاغەی (١٠) دە دیناریان پێ دەدان تا ڕێگایان بۆ خاوێن بکەنەوە و لە کەمین بیانپارێزن، ئەمەش بوو بە پیشەو جۆرە کاسبیەك بۆ جاشەکان. هەر شەوییێك کەمینیش نەبوایە، جاشەکان بۆ ئەوەی قاچاخچیەکان بە کرێ یان بگرن، دەیانکردە قاو کە ئەم شەو کەمین زۆرە. ڕۆژێك خەبەریان لەماڵێکدا کە پێشمەرگەی لێیە. عەسکەری هات و پێشمەرگەکەی بەدیل گرت. کەچی خەڵك جوامێرانی لە هێزەکەی عەسکەری ڕاپەڕین و پێشمەرگەکەیان ستاندەوە. ئەو سەرپێچەی خەڵك دەیکرد بۆ ڕژێم قابیلی قبووڵ نەبوو. بەهانەیان بۆ ڕژێم پەیدا کردبوو. بەڵام لەبەر ئەوەی جەنگی ئێران و عێراق لە ئارادا بوو، دەستکاری کردنی ئەم ئۆردوگایە ئاسان نەبوو. ڕژێم هەڵگرتبوو تا ڕۆژی خۆی دێت. هەرچەند خەڵك پێی وابوو عێراق لەم جەنگە ڕزگاری نابێت و دەڕوخێ. کەچی دوای هەشت ساڵ ئەم جەنگە ماڵوێرانکەرە لە ١٩٨٨/٨/٨ کۆتایی هات و عێراق ڕزگاری بوو.

دوای تەواو بوونی جەنگ ژمارەی سەربازەکان لە گشت بەرەکانی عێراق، کەم بۆوە. بەڵام لە بەرەی ناوچەی پشدەر نەك کەم بگرە زیادیشی کرد. کەس نەیدەزانی هۆی چیە؟ تا نیوەشەوێك بەرەبەری جەژنی ڕەمەزان ڕژێم دەوری ئۆردوگای بەستەستێنی گرت و باری کردن بۆ ئۆردوگای **حاجیاوا** و ئۆردوگای بەستەستێنی بە تەواوی چۆڵ و کاول کرد.



## دواقۆناغ و گەورەترین قۆناغی ڕاگواستن(*)

هەر لەگەڵ ڕاگواستنی ئۆردوگای بەستەستێن خەڵکی پشدەر بە گشتی ترسیان لێنیشت. ووتیان ئنجا نۆرەی ڕا گواستنی ئێمەیە. زۆر جاران ڕاکردن دەست کردنەوەیە بەرامبەر دوژمن. ڕاکردن بەرەو ئێران دەستی پێکرد، هەر ئەومەشەوە ئەوەی پارە و زێڕی هەبوو و دەیتوانی کرێی وولاغ بدات، بێ ئەوەی دەستکاری هیچ بکات ماڵی بە جێهێشت. کرێی وولاغ زۆر گران ڕێگاکان زۆر مەترسیدار بوون. بەڵام **عەباسی بایزی باڵوڵ ئاغا** کە سەرۆك جاش بوو ڕێگەیەکی لەشاخی قەندیل بۆ ئەو خەڵکە کردەوە. خەڵکێکی زۆر بەو ڕێگایەدا خۆیان دەرباز کرد. زۆر ماڵم بینی سفرەی نانخواردنی ئێوارەیان کۆنەکردبۆوە و ڕۆیشتبوون. یەك لەو ماڵانە ماڵی **ئەحمەد خاس** بوو کەدەستی ماڵ و مناڵیان گرت و بەر ڕێگەیەکی زۆر سەخت و ترسناکدا ڕوویان لە ئێران کرد. ڕژێم ئەو ڕێگایانەی گومانی هاتچۆی پێدا کردنی لێدەکرا، هەموویانی گرتبوو. بەڵام خەڵکی ناوچەکە شارەزا بوون دەیانتوانی خەڵك ڕزگار بکەن. ڕژێم بە تۆپی دوور هاوێژ ئەو ڕێگایانەی تۆپباران دەکرد. **ماڵی حاجی کاك حوسێن** یەکێك لەو ماڵانە بوون کە بەر ئەم تۆپبارانە کەوتن. ئەوەی پارەی نەبوو خۆی دەرباز بکا ناو ماڵی هێنایە سەر جادە و هەڕاجی کرد. ئەمانە نموونەی چەند ماڵێکن کە دەوڵەمەند بوون و زوو ڕایان کرد:

- عەزیزی مەحمودی کوێخا برایم
- مەحمودی مامە لاوە
- خدری مەحمودی کوێخا برایم
- ئەحمەد خاس.
- مەحمودی عەبدوڵا ئاغای سێوەڵێ
- مامۆستاخدری ئەحمەدی مەحموداغای کانیلان
- عوسمانی حەسەنی خانمێ

(*) ناوەرۆکی باسەکە لێرەوە دەسپێدەکات

- حاجی ڕەحمانی خدری خە یالێ و هەموو کوڕەکانی
- حاجی محمود اغا
- مەمەندی میناغا
- ئەحمەدی خدر سەبەتە
- بابەکری مەحمودی عەوێز اغا
- عەلی حاجی محەمەدەمینی مەرگەیی... زاوای کاك حەمە سور
- عەبدولاّی خدری حەسەنی خانمێ
- ئەحمەدی مەلا پیرۆت
- حاجی حوسێن حاجی عەبدولاّ و براکانی
- سەلیم محەمەد ئەمین ئاغا
- محەمەد ئەمین خاس
- خدری قالە بانەیی
- عەزیز خدر گەناوی و...

وای لێهات بە جارێك کەلوپەلی دوکان و ماڵەکانی خەڵکی قەڵادزێ هاتە سەر جادە و بە نرخێکی خۆڕایی دەیانفرۆشت. خەڵکی ناوچەکە گشتی فرۆشیار بوو کەس هیچی نەدەکڕی. عەسکەریە و خەڵکی شارەکانی باشووری عێراق بە تایبەتی عەرەب بە لێشاو دەهاتن و کەلوپەلیان لە پشدەریەکان دەکڕی. مشتەری چەندی پێدابا فرۆشیار رازی بوو. خەڵکەکە هاواری دەکرد:

ـ ماڵی سپی بۆ رۆژی ڕەش، ماڵ دەفرۆشین سەرمان رزگار دەکەین.

هەی لەوەی بتوانێت کرێی وولاغ پەیدا بکات و دەستی منداڵی بگرێت و بەرەو ئێران بڕوات. هەر شەوە کۆمەڵێك ماڵی دراوسێت باریان دەکرد.، رژێم بۆ رێگرتن لە راکردنی خەڵك کەتیبەیەکی هەندەسەی عەسکەری نارده ناوشار بۆ تەقاندنەوەی ماڵە راکردووەکان بە (T.N.T). هەر کە خانوویەکی لە گەڕەکێك دەتەقاندەوە ئەو گەڕەکەی دەهەژاند و خانووی دەوروبەر هەمووی درزی دەدا و نیوەرووخاو دبوو. زۆر



بێ بەزەییانە کەوتە ناو ئەو خەڵکە لێقەوما و سەر لێشێواوە وەك دڕندەیەکی بەرەڵڵا بە راست و چەپ شاری دەهەژاند دەیتەقاندەوە.

رۆژێکی زۆر ناخۆش بوو. لە راستیدا تەقاندنەوەی خانووەکانی ناو شار بە (T.N.T)، هەڕاج کردنی ناوماڵ و راکردنی خەڵك بەرەو چارەنووسێکی نادیار، بە چەند ووشەیەك یا لە چەند لاپەڕەیەکدا باس کردنی ئەستەمە. سەڕای ئەوەش خەڵك نەدەترسا، بە تەقاندنەوەی خانووەکان خەڵك زیاتر لە راکردن بەردەوام دەبوو. ئەم راکردنە بەم شێوە بێ منەتیە و گوێ نەدان بە ماڵی دنیا و رۆیشتن بەو رێگە سەخت و ترسناکەندا، دەست کردنەوەیەکی زۆر دلێرانە و لە خۆ بووردوانە بوو کە خەڵکی پشدەر دژ بە شالاّوی راگواستن نیشانیاندا.

ڕژێم زۆری پێ ناخۆش بوو، بۆیە وەفدێکی گەورە پیاوانی خۆی لە بەغداوە بە سەرۆکایەتی (**بابەکری مەحموداغای ـ وەزیری کاروباری کۆمەڵایەتی**) نارد بۆ پشدەر. ناوبراو هات قسەی بۆ خەڵك کرد و داوای لە خەڵك کرد واز لە راکردن بهێنن. گوتی، رژێم هیچ نیازی راگواستنی قەڵادزێی نییە و قەڵادزێش موقابیلی فاو حسابی بۆ دەکرێت کە چەند ساڵە خۆی بەرامبەر بە تۆپبارانی ئێران را گرتووە. سلاّوی سەرۆك (صدام حسین) ی بە خەڵکی راگەیاند و گوتی:

ـ دڵنیا بن قەڵادزێ راناگوێزرێ. راگواستنی بەستەستێن لە قەڵادزێ جیاوازە. ئۆردوگای بەستەستێن لەبەر قاچاخچیەتی چەك و تەقەمەنی و سیخوڕانی ئێران و پێشمەرگە ببووە جێگای نیگەرانی حکومەت. رژێم ناچار بوو ئەم ئۆردووگایە را بگوازێت، ئیوە مەترسن.

خەڵك چاك گوێی لێگرت بەڵام کەس باوەڕی بە قسە و بەڵێنەکانی نەکرد. دەیانزانی دوورن لە راستی. زیاتر خەڵکەکە لەوە نیگەران بوون کە دوای گەڕانەوەی بابەکر أغا بۆ بەغدا، حاجیاغای برای بابەکراغا رۆی بۆ ئێران، خەڵك گوتیان:

ـ دیارە راستیەکەی بە براکەی ووتووە و ئێمە نایزانین. نەیوێراوە بە خەڵکەکە بڵێ. لەبەر ئەوە رۆیشتن و راکردن بەردەوام بوو. ئینجا رژێم کەوتە رێگە گرتن.

ڕەبایەی لەسە هەموو ڕێگاکان داناو مینرێژی کردن. تەنانەت ڕێگەی نەهێشتەوە تاکە زەلام بتوانێ پێدا دەرباز بێ.ئیتر جموجوڵی ڕاکردن وەستا. خەڵك ئومێدی دەرباز بوونی نەما، دەستی لە کارو کاسبی شل بوو. دڵنیا بوون چارەنووسی قەڵادزێ بەرەو ڕا گواستنە. قسەو باسی خەڵك بوو بە ڕاگواستن و ڕانەگواستن. یەك دەیگوت ڕامان دەگوازن یەك دەیگوت نا هەریەکە قسەیەکی دەکرد.، دەیانگوت لە **عەرعەر** لەسەر سنووری عێراق — سعودیە شارێکیان بۆ دروست کردووین، بە ناوی (مدينة قلعةدزة). دەیانگوت صدام لە کۆبوونەوەی سەرانی دەوڵەتانی عەرەبی گوتوویەتی:

ـ مشکیلەی من ئەو دوو ملیۆن کوردەیە کە سنووریان لەگەڵ ئێرانە، مایەی کێشەیە بۆ نیشتمانی عەرەبیش.

دەیانووت بڕیار وایە دابەشمان بکەن بە سەر چەند دەوڵەتێکی عەرەبی و خەڵکی فەلەستینی بێنە شوێنمان. ڕۆژا نە ئەو باس وخوسە دەکرا.

کارو کاسبی ڕۆژانەی ئەم خەڵکە ئەم باس و خواسانە بوو. تا دەهات مۆتەکەی ڕاگواستن زیادی دەکرد. خەو و خۆاردنمان لێ حەرام ببوو. هاوینمان بەڕێ کرد و ئینجا زستان و دواتر بەرە و بەهار هاتین. خەڵك کیمیاباران و ئەنفالی لە ڕاگواستن پێ خۆشتر بوو، ترسی ڕاگواستن تا دەهات رووی لە زیاد بوون دەکرد.

ڕژێم بۆ شاردنەوەی نیەتی گڵاوی خۆی، دەستی کرد بە تەعمیراتی هەندێك شۆستە وجادەی قەڵادزێ کە بەڵێندەرەکەی **أحمد رشيد** بوو!. هەندێك خەڵکی سادە دڵیان بەوە خۆش دەکرد و دەیانگوت تازە ڕاماننناگوێزن.

ـ ئەگەر ڕامانبگوازێ بۆ ئەم پارەیە لەم شارە سەرف دەکەن؟!.

دەڵێن نەزان کە ڕووبەڕووی کێشە دەبێتەوە، پەنا دەباتە بەر خەون و خەیاڵ. کاتێك ئەم خەڵکە هەژار و بێ دەسەڵاتە، لەگەڵ ئەم ڕژێمە دڕندەیە ڕووبەڕووی ئەم کێشە گەورەیە ببۆوە، نەیان دەزانی چۆن خۆیان لەو شاڵاوە سامناکە ڕزگار بکەن. چیمان پێ دەکرێت؟ دەسەڵات چییە؟ چی بکەین چاکە؟ ڕۆژانی دەیان پرسیار ئاوامان لە خۆمان دەکرد. و شەویش بەم ترس و لەرزەوە سەرمان دەنایەوە. ڕاگواستن وێردی سەر زمانی خەڵك بوو. مێشکی خەڵك زۆر ماندوو بوو. مرۆڤ مێشکی بەچی ماندوو بێت دیارە



شەویش خەونی پێوە دەبینێ. بۆیە خەڵکەکە شەوانە بە مێشکی ماندوو بە ترس خەم سەریان دەنایەوە و خەونیان دەبینی و بەیانی بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە. گوێ یان بۆ یەکتری شل دەکرد. ئەگەر لێکدانەوەی خەونەکە گەشبینی تێدا بەدی کرابا دەیانگوت:

ـ خێر دەبێ، إنشا الله ڕامان ناگوێزن, خێر و سەدەقە دەکرا.

بەم شێوەیە، ئەگەر خەونەکە خۆش بوایە دەماودەم گشت ناوچەکە دەیان بیست. بۆ نموونە ڕۆژێك ووتیان، (مەلا پەپولە) کە پیاوێکی باش و خەڵك زۆر بڕوای پێ بوو, خەونێکی خۆشی بینیوە، تەعبیر لەوە دەکات کە ناوچەکە سەلامەت دەبێ. پۆل پۆل خەڵك ڕووی لە ماڵی مەلا دەکرد وخەونەکەیان پێ دەگێڕایەوە و ئیتر هەراسانیان کرد. کۆمەڵێك پیاوی ناسراوم بینی لە ماڵی مەلا دەهاتنە دەرەوە. زەردەخەنە بە سەر لێویانەوە دیار بوو. ڕوویان خۆش و هەموو گیانیان پێدەکەنی، هێشتا تەواو نەگەیشتبوونە لام، لە دوورەوە مزگێنی ئەوەیان پێ دام کە ڕاناگوێزرێین. وتیان مەترسە مامۆستا خەونێکی خۆشی بینیوە بڕۆ با بۆ تۆشی بگێڕێتەوە. من قسەیەکم کرد دیاربوو بە دڵیان نەبوو. ئەگەر پێ یان عەیب نەبایا دەمیان دەشکاند. خەونەکەی مامۆستا سەری بە هەموو ماڵێکدا کرد. خەڵك بۆ چەند ساتێك هەناسەیەکی خۆشیان هەڵمژی. ئەو شەوە خەڵك بە ئاسودەیی سەری نایەوە. تەمەنی ئەو ئاسوودەییش تا بیستنی هەواڵێکی تر بوو. سەردانی مەزارو شوێنە پیرۆزەکان زیادی کرد خەڵك بۆ پاڕانەوە و بۆ ئەوەی لەو شاڵاوە بیان پارێزن مەزار و جێ نەزەرگەکانیان هەراسان کرد. مانەوە لە مزگەوتەکان تا درەنگانی شەو، دوعاو پاڕانەوە لە خواو شەو نوێژ بەردەوام بوو. ئەهلی مەشروبیش لەم خەمە بێ بەش نەبوون، ئەوانیش بۆ لابردنی ئەو خەم قورسە زیادە خۆریان لە مەشروب خواردن دەکرد. خەڵکانێك کە ڕۆشنبیر بوون و بیری سیاسیان هەبوو بیریان لە شتی تر دەکردەوە تا پێش بەم شاڵاوەی ڕاگواستن بگرن. چی بکەن با شە تا ئەم ڕژێمە نەبیس و دڕندەیە قەناعەت پێبکەن واز لە ڕاگواستن بهێنی. لەم کات و ساتە ناسك و سامناکە دا دەنگ بڵاو بۆوە کە گوایە (محەمەدی مەهدی) هاتووە بۆ ناوچەکە و پەیامی پیرۆز دەداتە ئەم خەڵکە. ئەم هەواڵەش لە ماوەیەکی کەمدا بوو بە میوانی هەموو ماڵێك...

## سەرگوزشتەی سەرهەڵدانی (محەمەدی مەهدی)

لەم کاتەدا هەواڵێك بڵاو بۆوە کە گوایە لە گوندەکانی (گرتك و دوو گۆمان) سەر بە ناحیەی سەنگەسەر، پیاوێك پەیدابووە بە ناوی (سەید مستەفا)، لە سەیدەکانی مەرگە و لە بنەماڵەیەکی دینی ناسراوە. خەڵکی باوەڕی بەم بنەماڵەیە هەبوو. بەڵام خۆی دانیشتووی سەنگەسەر و فەرمانبەر بوو، دەیانگوت دەرچووی کولیجی شەریعەیە و زۆر بەدینە، عەرەبی و ئینگلیزی باش دەزانێ. بە دەمی خۆی رایگەیاند و گوتی:

ـ من (**محە**مەدی مەهدی)م لە لایەن خواوە رەوانە کراوم بۆ چاکسازی ئەم خەڵکە.

لە ماوەیەکی زۆر کەمدا خەڵکێکی زۆر باوەڕییان پێ کرد. پەرتوکێکی دانا بە ناوی (کلمات الله). رۆژ بە رۆژ و زۆر بە خێرایی خەڵك باوەڕی پێ دەهێنا. پۆل پۆل سەیارەیان دەگرت و دەچوونە لای، پارە و دیاری لە کەس قبوڵ نەدەکرد، ئەوەی دەچوو زیاتر باوەڕی پێ دەهێنا، دەیانگوت:

ـ زۆر زیرەك و روح سوکە، زۆر لە دین شارەزایە.

ـ دەیانگوت نوری لێ دەبارێ.

ئەوەی دەچوو بۆ لای پرسیاری لێ دەکرد ئاخۆ رامان دەگوێزن یان نا؟ یا چیمان بەسەر دێ؟ ئەویشخەڵکی دڵخۆش دەکرد و دەیگوت:

– مەترسن قەڵادزێ راناگوێزرێ دەست لە کاروکاسبی شل مەکەن, ناتانگوازنەوە.

ئەوسا خەڵکی پشدەر هەر لە سەرەتای بەهار خۆی ئامادە دەکرد بۆ کشتوکاڵی (توتن) و دەبوایە پارەیەکی باش خەرج بکەن بۆ بەرهەم هێنانی توتن کردن. خەڵکێکی زۆریش, پشت ئەستوور بە قسەکانی مەهدی رۆژ بە رۆژ گەرمتر دەبوون لە توتن کردن و خەرجیەکانی چاندنی کشتوکاڵ. چونکە بە خەڵکەکەی گوتبوو: بە ئیڤای عەسکەری باریشتان بکەن ئەوا لە دەربەندی کێوەڕەش دەتان گێڕنەوە. وای لێ هاتبوو کەس نەیدەتوانی بە خراپە باسی بکات چونکە دەوروبەری سەرکۆنەیان دەکرد و بە بێ ئیمان ناویان دەبرد. زۆر لە مەلاکان چوون بۆ لای باوەڕیان پەیدا کردبوو. ئەو مەلایانە بەیەکەوە چوون بۆلای:

- **مەلا سەید ئەحمەد واتە (مەلا پەپوولە)**



- **مەلا برایمی حەداد**
- **مەلا محەمەد ئەمین**

تەنیا یەکێك لەو مەلایانەی کە چوو بوو بۆ لای و من خۆم لێم پرسی چۆنی تێدەگەی (**مەلا محەمەد ئەمینی مام قاسم**)، گوتی:

ـ زەلامێکی زۆر زیرەك وشارەزایە و لە دین دا تێکچووە، بەس ناکرێ قسە بۆ هەموو کەس بکەین. تەنانەت وای لێهات لە ناو ماڵی خۆت نەتدەوێرا بە خراپە باسی بکەیت.

کارتی راگواستن دابەش کرا. کار لەکار ترازا و دەستمان لە بنی هەمبانەکە هاتە دەرێ. هەر لەو سەروبەندەدا برادەرێك بە ناوی (ق.م) چوو بۆ لای مەهدی و پشت ئەستوور بە قسەکانی کارگەیەکی ساردەمەنی هێنا بۆ ناوشار و دایمەزاند. کە خەڵك پێی دەووت وا رامانەدگوێزن تۆ بۆ ئەم پارەیە خەرج دەکەیت؟ گاڵتەی بە ئەقڵی ئەو خەڵکە دەهات کە لە راگواستن دەترسان. زەلامێکی تر کە چوو بوو بۆ لای پارچەیەك ملکی کڕی بوو کوڕەکانی رازی نەببوون، گوتبووی:

ـ هیچ نییە باریشمان بکەن دەمانگێڕنەوە و ناگەینە دەربەند. رۆژی بارکردن خەڵك تاکو دەربەندیش چاوەڕێی گەڕانەوە بوون، کە لە دەربەند ئاوا بوون ئیتر دەستییان کردبوو بە جنێودان.

تەنها ئەوەی زۆر بە ئاشکرا هاواری دەکرد و دژی وەستا (مەلا محەمەد دەڵگەیی) ئیمام جومعەی قەڵادزێ بوو. چەند جار لە نوێژی هەینی بە خراپی باسی کرد، و گوتی:

ـ پیاوی بێگانەیە باوەڕی پێ مەکەن. و بە ساختەچی و جادووگەری ناوی برد.

ئەم مەلایە لەم رۆژانەی نوێژی هەینیدا قسەی پێ گوت:

- نوێژی هەینی رۆژی ١٩٨٩/٢/١٠
- نوێژی هەینی رۆژی ١٩٨٩/٢/١٧
- نوێژی هەینی رۆژی ١٩٨٩/٣/١٧

لەم رۆژانەی هەینیدا مەلادەڵگەیی زۆر بە توندی هێرشی کردە سەری، بە پیاوی بێگانە و خۆفرۆش لە قەڵەمی دا. بەشدارانی نوێژی هەینی زۆریان پێ ناخۆش بوو و بە ناڕەزایی و بۆڵە بۆڵ لە مزگەوت هاتنەدەر چەند کەس نوێژی هەینییان بەتاڵ کرد بوو، وتبوویان دروست نییە نوێژی هەینی لە دوای ئەم پیاوە بکەین.

## چەند ڕووداوێکی تری پێش ڕاگواستن

ڕووداوێکی تر کە ئێمەی پتر تووشی دڵەڕاوکێ کرد ئەمە بوو: لە ڕۆژی (١٦ ی ئابی١٩٨٩) هەرسێك سەرۆکی عەرەب:

ـ عەلی عبداللە صالح (یەمەن).

ـ حوسنی مبارك (مصر).

ـ مەلیك حسین (ئوردن).

بە ئۆتۆمبیلێکی سەر بەتاڵ لە ناو بەغدا بە ناو خەڵکدا گەڕان. خەڵکی کورد ترسی لێ نیشت دەیانووت ئەم کارەیان لە سەر کەوڵی کوردە و دابەشمان دەکەن بەسەر ئەو سێ دەوڵەتانەدا. ڕۆژی (١٤ی ئازار ـ ٧ ی شەعبان ١٩٨٩) عێراق و ئێران لە بەرەکانی شەڕی خواروو ماوەی هەشت کاتژمێر لە یەکیان دا، کە ماوەی چەند مانگ بوو لە نێوان ئەو دوو دەوڵەتەدا شەڕ وەستا بوو، خەڵك خۆشحاڵ بوون دەیانگوت:

ـ شەڕەکە دەست پێ دەکاتەوە و بۆی ناکرێ ئێمە تەرحیل بکات.

شەوو ڕۆژ گوێمان بە ڕادیۆوە بوو تا بزانین ئیزگەیەك یا ڕۆژنامەیەك باسی کورد دەکات تا تۆزێك سەبووری دڵی خۆمانی پێ بدەینەوە.

ڕۆژی (٢ی ئازاری ١٩٨٩ ڕۆژنامەی الثورة زمانحالی حیزبی بەعس هاتبوو، کە دیتمان بە مانشێتێکی گەورە لە لاپەڕەیەکی دا نووسی بووی: **مناقشة مجلس قيادة الثورة بإعادة المدن والقصبات الحدودية.**

ئەم هەواڵە بۆ خەڵکی پشدەر زۆر خۆش بوو. زەردەخەنە کەوتە سەر لێوی خەڵك. لەیەکەم کاتژمێری گەیشتنی ئەم ڕۆژنامەیە گشت ماڵێك زانی و مژدەی ئەم هەواڵەیان دەدایە یەکتری. لە خۆتەوە هەستت دەکرد ئەم خەڵکە دڵی خۆشە. بە زەردەخەنە و ڕووی خۆشی باسی بڵاوکراوەی ئەم ڕۆژنامەیان بۆ یەکتری دەکرد. کێ ئازایە بتوانێ ئەم ڕۆژنامە پەیدا بکات. بە دەیان کەس لەبەر کتێبخانە ڕاوەستا بوون تا چاویان بەو ڕۆژنامەیە بکەوێ. نەخوێندەوارەکانیش بۆ ڕاستی ئەم هەواڵە ڕوویان لە کتێبخانەکان کرد بوو. باسی حاجیەکیان دەکرد کە لە جیاتی کتێبخانە



چوو بوو بۆ قوتابخانە بۆ ئەوەی ڕۆژنامەی پێ نیشان بدەن. ئەم ڕۆژەشمان بە دڵخۆشی و چاوەڕوانی ئەم هەواڵە بەسەر برد.

بەرەو بەهار دەرۆیشتین ڕۆژ بە ڕۆژ باسی ڕاگواستن گەرم دەبوو قسە و باسی هەموو ماڵێك و هەموو شوێنێك باسی ڕاگواستن بوو، بێ ئەوەی کەس بزانێ ئەم هەواڵە لە چ سەرچاوەیەك بڵاو دەبێتەوە. ترس و دڵە ڕاوکێی ڕاگواستن باڵی کێشا بوو بە سەر خەڵکی پشدەردا. لە ڕاستیدا زۆر جار سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی ڕاگواستن خودی پیاوانی ڕژێم بوون و ئەوان بڵاویان دەکردەوە.

جگە لەم هەموو باس و خواسەی خەڵك خۆی پێوە خەریك کرد بوو، ڕۆژێك ئیزاعەی لەندەن ڕایگەیاند و گوتی:

ـ ڕۆژنامەنووس دەنێرین بۆ باکوری عێراق.

خەڵکی بەم هەواڵەش کەوتنە کەش و هەوایەکی خۆش و دڵیان خۆش کرد، ئەم خەڵکە هەژارە پێیان وابوو ڕۆژنامەنووسی بەریتانی ماڵ بە ماڵ و گوند بە گوند دێن شوێنەکان دەبینن و پرسیار لە خەڵك دەکەن و، ئەمەش دەبێتە فشار بۆ سەر دەوڵەتی عێراق تا واز لە ڕاگواستن بهێنێت. بەڵام گشتی بە پێچەوانەوەی بیرکردنەوەی ئێمەی سادە و ساویلکە بوو. ئەگەر بشهاتنایە لە ئۆتێلە ڕاقیەکانی بەغدا بەرپرسانی ڕژێمیان دەدیت و چی یان پێ ووتبان ئەوەیان دەنووسی وبڵاویان دەکردەوە.

هەموو خەڵك باسی ئەم هەواڵەیان دەکرد، چەند کەسێك لە شوێنێکی قەرەباڵغ دانیشتبوون و باسیان دەکرد، گوێم گرتبوو، یەك دەیگوت:

ـ خودا دەکات دێن من هەموو قسەیە ك دەکەم، حکومەت چیم لێ دەکا با بیکات.

یەکێکی تر دەیگوت:

ـ پێشیان دەکەوم هەموو شوێنێکیان نیشان دەدەم با بمگرن.

تەمەنی ئەم هەواڵەش ڕۆژێك دڵ خۆش کردن بوو.

ئەم حاڵەتە بەم شێوەیە بەردەوام بوو تا ڕۆژی ١٩٨٩/٣/٣١ــ ١٤ی شەعبان، ئیمامی نوێژی هەینی مەلا دەڵگەیی لە نوێژی هەینیدا گوتی:

ـ هەواڵێکی ناخۆش هەیە پێم ووتراوە پێتان رابگەیەنم:

ـ ئەمساڵ رژێم ئەم دەڤەرە رادەگوێزێ. پێ یان گوتم دەبێت پێشوازی ئەم بریارە بکەین. هەروەها گوتی: ئێمەش وەفدێك لەم خەڵکە پێك دەهێنین و دەچین بۆ لای سەرۆك (صدام حسين)، بەڵکو ئەمساڵ وازمان لێ بهێنێت ساڵێکی تر خۆمان چۆڵی دەکەین. لەگەڵ بیستنی ئەم هەواڵە ناخۆشە خەڵك تاسا و بەگریان و بە دڵی پڕ غەم لە مزگەوت بڵاوەیان کرد و گەڕانەوە ماڵەکانیان. ئەم خەمە گەورەیە زیاتر باڵی کێشا بەسەر ئەم خەڵکەدا، خۆ ئەگەر عێراق ئەم بڕیارەی ساڵێك دوا خستبا ئێمە لە راگواستن رزگارمان دەبوو، چونکە عێراق تووشی جەنگی کوێت بوو بۆی نەدەکرا رامانبگوێزێ.

رۆژی ١ی نیسان ساڵی ١٩٨٩ هەڵبژاردنی **مجلس الوطني** بوو. کەسایەتییە دیارەکانی پشدەر هانی خەڵکیان دا بەشداری هەڵبژاردن بکەن و دەیانگوت:

ـ دەنگدان ئەمڕۆ لە بەرژەوەندی ناوچەکەیە.

پێیان وابوو بە بەشداری کردن لەم هەڵبژاردنە رژێم نیازی گڵاوی خۆی دەگۆڕێ و بەم **نەرم کێشی و باریك رستنە** وازمان لێ دەهێنێت. بە پێچەوانەوە رژێم خەڵکی بە بێ دەسەڵات و هیچ لە دەست نەهاتوو حساب کرد و زانی کەس هیچی لە باردا نییە و چی بوێت دەتوانێت بیکات.

لە چاو ساڵانی پێشوو خەڵك زۆر بەشداری لە هەڵبژاردندا کرد. بە پێچەوانەی هەڵبژاردنەکانی تر، رژێم رۆژی ٢ ی نیسانی کرد بە پشووی فەرمی، گوایە فەرمانبەران بە پرۆسەی هەڵبژاردنەوە ماندوو بوون. هەر ئەو رۆژە، شاندێك لە جەماوەری ناوچەکە پێکهات بۆ سەردانی بەغدا، کە بریتی بوون لە سەرۆك عەشیرەت و پیاو ماقوڵان و مەلا و خەڵکی دەسرۆیشتوو. شاندەکە بە رێ و رەسمێکی گەورە و جوان بە ئامادە بوونی خەڵکێکی زۆر، لە بەردەم مزگەوتی گەورە بە چەند سەیارەیەکی مۆدێل بەرزی ئەو کات، وەڕێخران. دیار بوو لە هەر تیرە و عەشیرەتێك یەکێك دەست نیشانکرا بوو. پێشەکی سەریان لە پارێزگای سلێمانی دا. پرسیان بە پارێزگاری سلێمانی شێخ جەعفەر کرد. هەر ئەو رۆژە گەیشتووبوونە بەغدا و لە ناوچەی **بەتاوین** لە **ئوتێل نازەنین** چەند ژوورێکیان گرتبوو. یەکسەر کەوتبوونە هەوڵ



و تێکۆشان و لە هەموو کەناڵێکەوە هەوڵیان دابوو (صدام حسين) ببینن. بیانزانیبا هەرکەسێك شتی پێدەکرێت هانایان بۆ دەبرد. هەر لە یەکەم رۆژەوە خەڵکی تەلەفۆنیان بۆ دەکردن، چیتان کردووە و هیچ دەکرێت بۆتان یان نا؟ ئەوانیش ئاوا دڵخۆشی خەڵکیان دەدایەوە و دەیانگوت: خەمتان نەبێت بە کەیفی خۆمان دەبێت، بەڵام رێگە مەدەن گەنجەکان هیچ جموجوڵێك بکەن!...

ئەو بەڕێزانەی شاندی خەڵکی پشدەر بوون و چوون بۆ بەغدا بریتی بوون لە:

- مەلا دەڵگەیی. ئیمام جومعەی قەڵادزێ: سەرۆکی شاندەکە- لە ژیاندا ماوە
- حەمەی کانەبی ئاغا. لە ژیاندا ماوە
- سمایلی حاجی قادر. لە ژیاندا ماوە
- حەمەی حاجی برایم باوزی. کۆچی دوایی کردووە
- شێخ حوسێنی بنەوشان. کۆچی دوایی کردووە
- مەمەندی سەلیماغای سەرتەپکان. کۆچی دوایی کردووە
- حەسنی ئەحمەدی حەماغای بێشیرێ. لە ژیاندا ماوە
- شێخ حوسێنی بۆسکێنی. کۆچی دوایی کردووە
- مەلا سەید سلێمان (ئیمام جومعەی سەنگەسەر). کۆچی دوایی کردووە
- حاجی محەمەدی حەسەنە جۆڵ کۆچی دوایی کردووە

ئەم بەڕێزانەش بۆ هاوکاری کردنی شاندەکە چوون بۆ بەغدا:

- برایمی کانبی باڵوڵ ئاغا.
- حوسێنی کامەلا.
- بابەکری وسوی.
- حەمە چکول.
- مەمەند سەلیم ـ قائیمقام.
- حوسێنی حەمەسور

دوای ٣ سێ ڕۆژ گەیشتبوونە ئەو قەناعەتەی کە هیچیان پێ ناکرێت و (صدام حسین) نابینن. دانیشتنیکیان کرد بوو یەکێك لە شاندەکە گوتبووی خۆماندوو کردنی ناوێت ساڵێکی تریش لێرە بین سەدام حسین نابینین. ئەوکەسە نمونەیەکی ساڵی ١٩٧٠ خۆیانی بۆ جەماعەت گێڕابۆوە کە چۆن لە ماوەی چەند کاتژمێرێکدا **احمدحسن بەکریان** بینیوە. گەیشتبوونە ئەم قەناعەتە کە سەدام نابینن، بەڵام ووتبوویان تا لێرە بین باشترە لەوەی بە نائومێدی بگەڕێینەوە ناو خەڵك. لەوە ترسابوون ئەگەر بە نائومێدی بگەڕێنەوە کێشە و ئاژاوە دروست دەبێت و ناوچەکە تووشی کارەسات دەبێت. ووتبوویان لێرەوە لە هەوڵ و تێکۆشاندا دەبین بەڵکو شتێك بکەین. لە راستیدا لەم ئانوساتەدا کە خەڵك دڵ پڕ و بریندار بوون، ئەم شاندە بە نائومێدی بگەڕابایەوە، بە هیچ شتێك گەنجەکان کۆنترۆڵ نەدەکران. بەدڵنیاییەوە کێشە دروست دەبوو و خراپیش بەسەر ناوچەکەدا دەشکایەوە. دوور نەبوو توشی کارەسات ببین...

من وەك ئەوسای گەنجیەتیم ئاگاداری ئەو ڕووداوە مێژووییەم و وەك خۆی دەیگێڕمەوە. هەقم نییە کێ بەدڵییەتی و کێ بەدڵی نییە. کێ رەخنەم لێدەگرێ یا لێناگرێ. یا ئەوانەی لە ڕووداوەکاندا بەشدار بوون چییان گوتووە و نیازیان چی بووە. لای من ئەوە گرینگە بە ویژدانەوە وەك خۆی بیگێڕمەوە. چونکە نیاز و دەروونی کەس بۆ کەس ئاشکرا نییە. من بێ ئەوەی خاتری کەس بگرم کێ چی ووتووە باسی دەکەم. تەنیا دەتوانم وەك تێبینی خۆم یەك شت بڵێم، ئەویش ئەوەیە: خۆی لە خۆیدا خەڵکەکە ببوون بە دوو بەش: خەڵکی گەنج و ڕۆشنبیر و خەڵکی بەساڵداچوو. گەنجەکان قبوڵ نەکردن و بە گژدا چوونەوەیان هەڵدەبژارد. بەساڵداچووەکان قبوڵ کردنی ئەمری واقیع. ئاشکرایە گەنجان خوێن گەرمترن لە بەساڵداچووان. دیارە هەر مرۆڤێك ناوچەکەی خۆی خۆشدەوێت. بەڵام خۆشەویستی خەڵکی پشدەر بەرامبەر بە شار و ناوچەکەیان لە خۆشەویستیدا نەما بوو، ببووە رادەی پەرستن و ئامادە بوون گشتیان بکوژرێن نەك ئەم خاکە چۆڵ بکەن. گشت گەنجی شارەکە خۆی ئامادە کرد بۆ بەرەنگاری و چەکیان پەیدا کرد. تەنانەت بۆ خۆپاراستن لە چەکی کیمیاوی دوژمن، هەموویان دەمامکی کیمیایان بە وردەخەڵوز و قوماش دروست کرد. لە راستی دا



ئەم چینە گەنج و ڕۆشنبیرە هەرچەندە کەم ئەزموون بوون، بەڵام بێ فرت و فێڵ، نەترس، پیاوچاك و راستگۆ بوون. ئەوەی لە دڵیان دا بوو ئاشکرایان دەکرد. جگە لە پەیدا کردنی چەك و تەقەمەنی، هەر گەنجە کۆمەڵێك دەرزی و دەرمان و لۆکە و لەفاف... کرد بوو بە کۆڵەپشت بۆ ڕۆژی لێ قەومان. هەرچەندە دەشیان زانی دەرەقەتی ئەم رژێمە نایەن و هیچیان پێ ناکرێت جگە لە خۆبەکوشتدان و ماڵوێرانی نەبێت، بەڵام مردنیان پێ باشتر بوو لەوەی لە ناوچەکەی خۆیان بە زۆر دەربکرێن.

لە ڕۆژی ٤ چواری نیسان ـ ٢٨ ی شەعبان ١٩٨٩، کاتژمێر (١٠) دەی پێش نیوەڕۆ تووشی **برایمی محەمەدی میران** و **عوسمانی تۆفیقە سور** بووم. بە دڵێکی غەمبار و بە پەشۆکاویەوە گوتیان دەزانی راگواستن بوو بەڕاست، ئێستا لە قایمقامیەت بووین سەیارەیەکی تاکسی لە پارێزگای سلێمانیەوە هاتووە، کارتی راگواستن و چەند فەرمانبەری پێیە.

برایم بەدڵ گەرمیەوە گوتی تاکەی؟! با خۆمان بە کوشت بدەین، دەخەریك بن شتێك بکەن، خەڵك هەموو ئامادەیە و لەگەڵتانە!

من هەر ئەو کاتە چووم چەند برادەرێکم بینی کە نوێنەری حزبەکان بوون. رامان گەیاند هەرچی خەڵکە دوای نان خواردنی ئێوارە بێنە گەڕەکی **گەرەکی کارەبا**. دوای نانخواردن هەرچی گەنج و قوتابی و مامۆستا و ڕۆشنبیری شارەکەیە کۆبوونەوە. وا ڕێکەوت ئەو شەوە زۆر تاریك بوو کارەبا نەبوو. رامانگەیاند کە کارتی راگواستن قبوڵ ناکەین و، کاتێك فەرمانبەرانی رژێم هاتن بۆ بەر ماڵەکانمان وەك هەنگاوی یەکەم بێ دەنگ دەرگایان بو ڕوودا دادەخەین و کارت وەرناگرین. هەر ئەوکاتە ئەو کۆمەڵە گەنجە پۆل پۆل دابەش بوون بە ناو شاردا و خەڵکیان ئاگادار کردەوە. چوون بۆ مزگەوتەکان نوێژکەر و مزگەوتەکانیان ئاگادار کرد کە کەس کارتی راگواستن قبوول نەکات. پۆلێك لە گەنجەکان بۆیان گێڕامەوە ووتیان **مەلا حوسێن عەلی ئاغا** لە مزگەوتی خانەقا و **محەمەدی سەکینە** لە مزگەوتی گەورە، لێمان توڕە بوون. بەڵام مەلا حەمەدەمین لە مزگەوتی مام قاسم دەستخۆشی لێ کردوین و گوتویەتی:

ـ حەقی خۆتانە و بە خەڵکی ووتوە، ئەوەی لەسەر خاکی خۆی بکوژرێت شەهیدە و دەچێتە بەهەشت.

ووتیان قسەی **مەلا حەمەدەمین** مان زۆر پێ خۆش بوو. هەر ئەو شەوە شارمان ئاگادار کرد. ئینجا ووتیان دەبێت ئۆردوگای پێماڵکیش ئاگادار بکەین. سەیارەیەکیان بۆ من هێنا و چووم بۆ پێماڵك، پیاوێکی ناسراوم بینی بڕیارەکەم پێڕاگەیاند. ووتی ئێمەش لەگەڵ شارەکەین و چی بکەن وا دەکەین و هەرئێستا ئێستا خەڵك ئاگادار دەکەین کە کەس کارت وەرنەگرێت. کە گەڕامەوە ناو خەڵکەکە، چەند گەنجێك هاتنە پێش لایتی سەیارەکە و زۆر بە نارەحەتی و دڵ گەرمیەوە جنێویان بە پیاو ماقوڵ و ریش سپیەکان دەدا و گوتیان: ریش سپییەکان وازمان لێناهێنن. وتیان:

دوای تۆ **مام قادر** واتە **قادری کوێخا وسو** هاتووە زۆر خۆی لێمان تووڕە کردووە و پێی گوتووین: بۆ وا دەکەن بۆ وا هاربوون بە قسەی کێ کارت وەرناگرن و تووشی کیمیا باران و ئەنفالمان دەکەن. بۆ خاتری خوا کاری وا مەکەن، ووتبووی هەر ئەم ئێوارەیە شاندەکە لە بەغدا هەواڵی ئەم گێرەشێوینەیان بیستووە و چەند جار تەلەفۆنیان بۆ کردوین کە فریا بکەوین نەهێڵین گەنجەکان هیچ بکەن و کۆنترۆڵیان بکەین. مام قادر ووتبووی چەند ساڵە **تەق تەق و دەربەندیخان** کارتیان وەرگرتووە و هەر لە شوێنی خۆیانن. کارت وەرگرتن مانای وانییە رامانەدەگوێزن. ووتبووی هەر کاتێك قەڵادزێیان راگواست من لە ئیڤای عەسکەری بکەن و رامبکێشن. **محەمەدی وەستا عەلی ـ کە ئێستا ئەندامی مەڵبەندی یەکێتییە**، دەمەتەقەیەکی زۆری لەگەڵ مام قادر کردبوو. مام قادر نەیتوانی بوو خەڵکەکە قەناعەت پێ بکات کە کارت وەرگرن و بڵاوە بکەن. گەنجەکان بەمنیان گوت دەبێ بچی قسەی لەگەڵ بکەیت.

من هەر ئەو کاتە، کە کاتژمێر ١٠,٥ دە و نیوی شەو بوو، لەگەڵ چەند کەسێك چووم بۆلای مام قادر لەبەر دەرگای ماڵی خۆیان کەوتینە گفتوگۆ، بەڵام نەگەیشتینە قەناعەت. گوتی کاکە ئەوەی من پێتان دەڵێم قسەی وەفدەکەیە، لە بەغداوە لە



ئێوارەوە چەند جار تەلەفۆنیان بۆ کردووین دەڵێن پێڕابگەن مەهێڵێن هیچ رووبدات و کونترۆلی گەنجەکان بکەن، دواتر گوتی:

ـ خۆ تەنیا من حیساب نیم، با بچینە لای **کاك حەمە سوور**. مام قادر پشتێنی نەبەست، پێڵاوێکی بە سەر پێوەکرد و پێکەوە رۆیشتین خۆمان بە ماڵی کاك حەمە سوردا کرد. کەسیان نەنوستبوون لە ناو هۆڵەکەدا دانیشتبوون. دوای وتوێژێکی زۆر بۆ یەکتریمان نەسەلماند. دڵگەرمی لە هەردوو لامان بەدی دەکرا. کاك حەمە سوور گوتی:

ـ ئەی کوا هۆمەری حاجی مووسا؟ برۆن بە دوایدا، با ئەویش ئاگادار بێت، ئەویش ریشسپی شارەکەیە.

کاتژمێر لە ١٢ دوانزەی شەو تێپەڕی بوو. بە سەیارەیەکی پیکاب چووم بە دوای کاك هۆمەردا، نووستبوو زۆر پێی سەیر بوو، گوتی: بەم شەوە درەنگە بۆ کوێ بێیم؟ گوتم: کاك هۆمەر ئێوە ریش سپی شارەکەن. گەنجی شارەکە گشتی لە سەر جادە کەوتوون. وەرن قسەیەکی لە سەر بکەن. من و کاك لە پێشەوەی پیکابەکە سوار بووین. وەك هێشووە ترێ گەنجان خۆیان بە پیکابەکە هەڵواسی بوو. بەم نیوەشەوە چەند سەیارەی پڕ لە گەنج دوامان کەوتبوون و هاواریان دەکرد: **خاکی خۆمانە لێرە ناڕۆین لێرە ناڕۆین**. دەیانگوت:

**تۆپ و تانك و تەیارە**

**دەرمان ناکا لەم شارە**

ووستم بێ دەنگیان بکەم بەڵام نەمتوانی. دیسان لەگەڵ کاك هۆمەردا خۆمان بە ماڵی کاك حەمە سوردا کرد. زیا تر لە ٣٠ گەنج لەگەڵ ئێمە دا هاتنە ژوورەوە. دەمەتەقێ دەستی پێ کرد بۆ یەکترمان نەدەسەلماند. لە راستیدا زۆر لەو گەنجانەی دوامان کەوتبوون بە دڵگەرمی بڕیاری توندیان دەدا بێ ئەوەی بیر لە ئەنجامەکەی بکەونەوە. ئەوانیش بە دڵگەرمی جوابیان دەدایەوە. ووتمان ئێمە حیساب نین. وەرنە ناو گەنجەکان و قسەیان بۆ بکەن بزانن دەڵێین چی. بە کۆمەڵ هاتینە دەرێ. کاك حەمە سور بەدەم قاچ هێشانەوە، لەگەڵ **مامۆستا ئازاد و مام قادر و کاك هۆمەر**

هاتنە ناو خەڵکەکە. کە لە ناو دەرگای ماڵی کاك حەمە سور دەهاتینە دەرێ، سەیارەیەك وەستا، **ئەحمەدی حەمەی حاجی برایم باوزی** دابەزی بە دەست راوەشاندن هاواری کرد:

ـ راوەستن کاکە راوەستن بۆ خاتری خوا، بابم ئێستا تەلەفۆنی بۆ کردم لە بەغداوە دەڵێ:

کە پێتان رابگەیەنم لێیان تێکنەدەین و نەهێڵین گەنجەکان هیچ بکەن، چونکە کارەکانمان تەواو کردووەو راگواستن الغا دەکرێ، گوتی:

ـ بابم دەڵێ: وەك هێلکە پاکمان کردووە لێ گەڕێن با بیخۆین، بۆ خاتری خوا هیچ مەکەن، دەنا ئەوان لە سێدارە دەدرێن.

من گوتم: کاك ئەحمەد خوا بکا وا بێت ئێمەش خزمەتکاریان دەکەین.

کاك هۆمەر و مام قادر و مامۆستا ئازاد هاتن، گوتیان گەنجەکان کوان؟ بەم تاریکە شەوە کەس نەچووبۆوە بۆ ماڵەوە، گشتیان لەسەر شۆستە و جادەکان و حەوشی مزگەوتی کارەبا پاڵیان دا بۆوە. بانگمانکردن. ئەوان کەوتنە قسەکردن بۆیان. بەڵام نەیانتوانی قەناعەت بەگەنجەکان بکەن کە بڵاوە بکەن و داوا لە خەڵك بکەن کارتی راگواستن وەرگرن. هەرکە یەك لە ریش سپییەکان قسەی دەکرد، ١٠ دە گەنج وەڵامی دەدایەوە. بێ سوود بوو. لە راستیدا ریش سپیەکان نەیاندەویست هیچیان بە تەنیا بڕیار بدەن. دەیانویست هەرچی بکرێ، بڕیاری هەموو ریش سپیان بێت نەك دواتر بە خراپ بە سەریاندا بشکێتەوە. لەبەر ئەوە لە بڕیاردان یەکتریان تێوە دەگلاند.

بە راستی گەنجی ئەو سەردەمە زۆر نیشتیمانپەروەر بوون. حازر بوون لە سەر خاك و وولاتیان، خۆیان و کەس وکاریان بە کوشت بدەن.

بەیانی دائیرەی ئەمن، بۆ ئەوەی کەس کۆبوونەوە نەکات. بە چەند سەیارەیەك بە جادە و کۆڵانەکاندا دەهاتن و دەچوون. ئاگارداریان کردین کە هەر ئەم شەوە دائیرەی ئەمن بە تەلەفۆن لەم کەین و بەینەی خەڵك ئاگادار کراوە. ئەوسا دائیرەی تەلەفۆن هەمووی فیشە بوو. قسەت لەگەڵ کێ کردبا دەبوایە داوا لە بەدالە بکەی بۆت



وەربگرێ. و مأموری بدالەش دەیتوانی بە ئاسانی گوێ لە قسەکانت رابگرێت. زانیمان کێ هەواڵی بڕیار و جموجوڵی ئەم خەڵکەی پێگەیاندوون. لە راستیدا رژێم نەیدەویست کەس بگرێ. دەیزانی گرتن کارەکە ئاڵۆزتر دەکات. سەرەتا نەیویست کارت دابەشکردن لە شارەکەوە دەسپێبکات، چونکە دەیانزانی داینەمۆی خۆراگرتن و رەتکردنەوە، نیازی گەنجی شارەکەیە. رژێم ویستی لقوپۆپی شارەکە بکات و شار بە تەنیا بهێنیتەوە. بۆ چوونەکەیان راست بوو. سەرەتا لە شارەوە دەستپێکردبا بەدڵنیاییەوە کیشە دروست دەبوو. دیار بووە پیلانداڕێژەکە زۆر زیرەکە. بەیانی زوو رژێم وەخۆکەوت و دەستی کرد بە دابەشکردنی کارتەکانی راگواستن. دەیزانی بەدواکەوتن، پرۆسەکە زەحمەتتر دەبێت. هەر ئەو رۆژە (واتە ٥ی نیسان) پیاوانی رژێم لە ئۆردوگای **تەوسوران** لە گەڕەکی **کانیتووەییان** چوون بۆ ماڵی یەکێك لە پیاوانی خۆیان. لەوێ خەریك بوو ئاژاوە روو بدات، چونکە هەڵشۆییەکان چوونە سەر ئەو ماڵە کە بۆ کارتیان وەرگرتووە؟ لە راستیدا ئێمە کەمتەرخەمیمان کرد، دەبوایە هەموو خەڵکی ناوچەکە ئاگادار بکەینەوە کە کارت وەرنەگرن، بەڵام دەرفەت نەبوو. بڕیارەکە هەر ئەو شەوە درابوو، رێگاکان داخرابوون. پێش بانگی ئێوارە بازگەکان دادەخران تەلەفۆنیش نەبوو هەشبا نەدەکرا بە تەلەفۆن خەڵك ئاگادار بکەین.

ئێمە، ئەم کۆمەڵە کەسەی لە خوارەوە ناویان هاتووە راوەستابووین و سەیری ئەم وەزعەمان دەکرد:

- قادری مام کەریم ـ بەڕێوەبەری خوێندنگای ئامادەیی
- مستەفای فەقێ محەمەد/ مدیر با نقی قەڵادزێ (ئێستا)
- زاهیر ئەحمەد حاجی حەمە أغا
- برایم رەسوڵ میران و براکانی
- محەمەدی مینە بەگ
- مامۆستا عومەری مینە قنجە
- قادر و عەبدوڵای حەسەن قەیسی

- **محەمەدی وەستا عەلی/ کار گێڕی مەڵبەندی ٢٤**

ئەو رۆژە رژێم بە گورجی دەستی بە دابەشکردنی کارتەکان کرد. ئێمە کە خەبەرمان بۆ هات کارت دابەشکردن لە ئۆردوگای **تووەسوران** دەستی پێ کردووە، چەند گەنجێك کۆبووینەوە، راوێژمان کرد، چی بکەین؟ و چیمان پێ دەکرێت؟. سەیارەیەکی ئەمن بۆ ئەوەی بمانترسێنێت، بە لاماندا تیژ تێپەڕی. دوای (٢٠) بیست خولەك. پیاوێکی گەنجی قەڵادزێی کە بە ئاشکرا سەر بە ئەمن بوو و، خەڵك بە گشتی دەیانناسی بە پەشۆکاوی هاتە لامان و گوتی: بڵاوەی لێ بکەن ئێستا دائیرەی ئەمن دێ بۆ گرتنتان. برادەران ترسان و بە راست وەریانگرتز گوتم:

ـ مەترسن دائیرەی ئەمن خۆی ناردوویەتی تا بترسین و بڵاوە بکەین. گوتم: ئەو کوڕە خۆی پیاوی دائیرەی ئەمنە، چۆن دەتوانێ وا بە ئاشکرا نهێنی ئەمن بباتە دەرەوە، بووچوونەکەمان راست دەرچوو.

رژێم هەوڵەکانی ئەو خەڵکەی بە کاری رێکخراو و کاری سیاسی لەقەڵەم نەدەدا، دەیزانی خەڵکێکی دڵشکاون و ناوچەکەی خۆیان خۆشدەوێت. گەورە پیاوانی رژێم لە ناوچەکەدا بە راگواستنی ئەو دەڤەرە خۆشحاڵ نەبوون، نەك لەبەر دڵسۆزی و خۆشەویستیان بۆ خەڵك، بەڵکو لەبەر بەرژەوەندی خۆیان. هەر بەرپرسێك لەم ناوچەیەدا کۆمەڵێك دەستکەوتی هەبوو. هەموویان لە سایە سەری ئەم بارودۆخەی پشدەر دەوڵەمەند ببوون. خەڵکیش لێیان دەترسا و رێزی لێدەگرتن. ئەوانیش لە شوێنی خۆیان یان لە جنوب ئاوایان بۆ نەدەڕەخسا، بۆیە حەزیان دەکرد خەڵك خۆراگرێ و شتێك بکات، تا ئەوانەی قیادە قەناعەت بکەن واز لە راگواستن بهێنن. ئەم کاربەدەستانەی خەڵکی ناوچەکە و لەگەڵ رژێم بوون، زۆر شتیان پێدەگوتین و بەنهێنی راو بۆچوونی بەرپرسانیان بۆ باس دەکردین.

کارت دابەشکرا و هاوکات بەردەوام تەلەفۆنی دڵخۆشکەرمان لە بەغداوە بۆ دەهات. دەیانگوت مەترسن هیچ نییە، راگواستن لەسەر قەڵادزێ لاچووە. هیچ مەکەن، مەیشێوێنن لێمان تێکمەدەن و تووشی کارەساتمان مەکەن، لەم جۆرە قسانە.



بێ ئەوەی هیچیان کرد بێ و کەسی ئەوتۆیان بینیبێ کە هیچی پێ بکرێ، هەر رۆژە پۆلێك خەڵك دەچوو بۆ بەغدا بۆ لای شاندەکە تا لە زاری خۆیانەوە هەواڵێکی دڵخۆشکەر و تازە ببیستن .

من لەسەر راوێژی برادەران، رۆژی (٨ هەشتی نیسان) بە ناوی نەخۆشیەوە لەگەڵ **حەمە زرینگی** ئامۆزاشم چووم بۆ بەغدا. لە بەغدا چاوم کەوت بە شاندەکە لە راستیدا هەموویان بێ ئومێد و رەشبین بوون. یەکێك لە ئەندامانی شاندەکە پێی گوتم:

ئاگات لە خۆت بێت لێرە بە خراپ باست دەکەن. هەر لەوێ بە دزی چاوم کەوت بە (سمایلی حاجی قادر) و قسەی زۆری بۆ کردم، هەرچۆنێك بێت (مەلا دەڵگەیی) م بینی، ئەو رەشبین  هاتە بەرچاوم ئەم چەند ووشەیەم لێ بیست، گوتی:

ـ ئێمە هیچمان پێ ناکرێت. خەڵکەکەش هەونییە. من لێرەش لە خۆم دەترسم بمکوژن. ماوەیەکی باش لەگەڵ (حەمەی حاجی برایم باوزی و سمایلی حاجی قادر) دانیشتم. بێ پێچ و پەنا زۆر قسەمان کرد. بە رای من مەلا دەڵگەیی دژ بە بیرو بۆچوونی گەنجەکان نەبوو. کاك سمایل گوتی:

ـ ئێمە دەزانین ئەو گەنجانە و دڵسۆزن و لە خۆبووردوون. دڵنیاین خۆیان لە پێناوی ناوچەکیان بە کوشت دەدەن. بەڵام ئێمە بە بەرژەوەندی نازانین هیچ کاردانەوەیەك هەبێت. ئەم رژێمە زۆر دڕەندەیە تووشی ئەنفال و کیمیابارانمان دەکات. با فێل لەخۆمان نەکەین ئەم حکومەتە هیچی لەگەڵ ناکرێت، هەروەها گوتی:

ـ ئێوە کە دەڵێن پێشمەرگە دێتە خوارێ هاوکاریمان دەکات، راست نیە!. دەبا ئەوان بێن بۆ توەسوران و سەنگەسەر رێگاکان بگرن، ئێمەش ناوی خوای لێ دەهێنین و رادەپەرین ئینجا هەرچی دەبێت با ببێت. دەزانین کەس بەهانامانەوە نایەت. ئێمەش دەرەقەتی دەوڵەت نایەین. لە راستیشدا پێشمەرگە ئەوەندە نەما بوو بتوانن پارێزگاری بارەگای سەرکردایەتیەکانی بکەن. زۆر لەم قسانەیان بۆ کردم. لە راستیدا منیش قسەکانم بە هەند وەرگرت، بەڵام قەناعەت پێکردنی گەنجەکانیش ئاسان نەبوو. قبوڵیان نەدەکرد دەستەو ئەژنۆ دانیشن و هیچ نەکەن.

هۆڵی ئەو ئوتێلەی لێی بووین زۆر قەرەباڵغ بوو. دیتم **حەمەی کانبی ئاغا**، لە بێ دەسەلاتی و مەغدوری خۆیان کە هیچیان بۆ ناکرێت، چۆن رقی هەڵسا بوو. کوڵی گریان لە گەرووی دابوو،گوتی:

ـ هاتۆتە سەرم بچم لە بەردەم قەسری جمهوری خۆم بخەمە ژێر سەیارەیەکی عەسکەری بمکوژێ، بەڵکو دەنگ و سەدایەکی لێ پەیدا بێت و، دوای من جەماعەت بتوانن صدام حسین ببین. لەبەر ئەو باودۆخەی خەڵك تووشی ببوو، ئەو زوڵم و ستەمەی لێیان دەکرا، ئەو هەموو زیانەی ماڵ و سامان کە لێیان کەوتبوو، کافر بەزەیی بەحاڵماندا دەهات.

شاندەکەش، جگە لەو ناو و ناتۆرەی خەڵکی بێ ویژدان، گوێ پێ نەدانیان و ئیهمال کردنیان لە لایەن رژێمەوە، وەلامدانەوەی ئەو هەموو خەڵکەی لە شارەکانەوە دەهاتن بۆ لایان بۆ بەغداد و دەیانپرسی چیتان کردووە؟، فشاری خەڵکیان زۆر لەسەر بوو. لە لایەکی ترەوە چەند قوتابی و سەربازی کوردی بەغدا و باشووری عێراق، ئێواران دەچوون بۆ ئۆتێل بۆ لای شاندەکە تا هەواڵێکی خۆش ببیستن. ئەوانیش ناچاربوون درۆ بۆ خەڵك بکەن و دڵخۆشیان بدەنەوە. تێکڕای دانیشتوانی پشدەر چاویان لە دەمی ئەوان بوو. بەراستی شاندەکەش سەرەرای گرفتی خێزان و ماڵ و سامانی خۆیان لە بارودۆخێکی رەوانی زۆر ناڵەبار دابوون.

رێزی هەر نەتەوەیەك بە خاکەکەیەوە بەندە کە خاکی لەدەستدا، ئەو رێز و حورمەتەی هەیەتی نامێنی. بۆ تاکیش هەروەایە، کورد گوتەنی بەرد لە جێگای خۆی بەسەنگە. دانیشتوانی پشدەریش دەیانزانی ناوچەکەیان لە دەست بچێت، نەك لە ئوردوگا بگرە لە ناو شارەکانی تریش بن، سووك و چرۆك دەبن.

ئێوارەی ٩ ی نیسان خەڵکێکی زۆر لە بەر ئوتێل نازەنین وەستا بوون و چاوەروانی هەواڵی خۆش بوون. دوو کەس لە شاندەکە زۆر بە بێ ویژدانی قسەیان بە گەنجەکانی قەلادزێ گوت، ناوناتۆرەیان دەدانە پاڵیان. لەو کاتە مەلا دەڵگەیی زۆر بە حەماسەتەوە رەدی دانەوە و گوتی: نەخێر وانیە، ئەم قسانەم قبوڵ نییە. بەبێ



ویژدانی قسە بەو گەنجانە مەلێن، ئەو گەنج و رۆشنبیرانە ئەوپەڕی دڵسۆز و لە خۆبردوون. وولات و شاری خۆیان خۆشدەوێت. حەز دەکەن لە پێناو شارەکەیان خۆیان بە کوشت بدەن و ریگە نەدەن رابگوازرێن. ئەگەر لە کاردانەوەی هەر کارێکی ئەو گەنجانە، ناوچەکە خوانەخواستە تووشی هەر زیانێك بوو ئەوە خیانەت نییە ،ئەوە هەڵەیە، خیانەت و هەڵە زۆر لەیەك جیان، بۆ ئەمەش ئاماژەی بە کورتە بەستەرهاتێك کرد.

بەم قسانە خەڵکەکەی بەردەم ئوتێل، هێوڕ بوونەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تەواو بێ ئومێد نەببوون. جەماعەت هەر خەریکی مشتومڕ بوون و لە کەناڵێکەوە بەڵێنیان پێدا بوون خەزووری صدام حسین (خیر الله تلفاح) ببینن. بەیانی بە پیکابێکی دەبڵ کابین، بە دەست و دیاریەکی زۆرەوە، چوار پێنج کەسیان هەڵبژارد کە بچن بۆ لای حاجی خیراللە لفاح. چاوەڕێم کرد بزانم چی یان بۆ دەکرێ. بە کەمێك دلخۆشییەوە گەڕانەوە. دەیانگوت:

ـ زۆر سەرزەنشتی مدیری ئەمنی کردووە، پێی گوتوە: ئێوە هەموو دوژمنی بەعسن، شیوعین دەتانەوێ بەعس بە هەڵە بەرن. گوایە مدیر ئەمن هەر بە ووشەی (نعم) و بە ووشەی رێز وەلامی داوەتەوە. من لە مەلا دەڵگەیم پرسی تۆ بڵێی هیچمان بۆ بکات؟ گوتی:

ـ با خەزووری صدامیش بێت، باوڕناکەم ئەم زەلامە هیچی بۆ بکرێت. گوتی بە رای من تەوجیهاتی (صدام حسین) خۆیەتی کە رێزی لێ بگیرێت، قسەی لێ قبوڵ بکەن بەلام هیچی بۆ نەکەن. هەرواش دەرچوو. حەسەن ئەحمەد ئاغا وتبووی گەر بێتو کارێکی وابکەیت رامان نەگوازن، ئێمە هەموومان دەبینە رەعیەتی جەنابت.

شاندەکەی بەغدا دوای ئەم هەموو هەوڵ و تەقەلایە. نەیانتوانی صدام حسین ببینن و هیچیان بۆ نەکرا.

ڕۆژی ١٠ی نیسان من گەڕامەوە قەلادزێ. چیم بیست بوو هەموویم بۆ برادەران گێڕایەوە. رۆژی ١١ ی نیسان خەڵکی قەلادزێ هاتنە سەر جادەکە بە هە لهەلە و هەڵپەڕکێو رەشبەڵەك، لە هەموو کۆڵانەکان شایی بوو و شیرینی دابەش دەکرا و پێ

کەنین و خۆشی لە رووی خەڵکەکە دەبینرا، پیرو جوان شایی دەکرد، ئەوەی رێگەی نەدەدا کچەکەی سەیری شایی بکات ئەو رۆژە لە رەشبەڵەك سەرچۆپی گرتبوو، هەرچی سەیارە و تراکتۆری ناو شار هەیە بە هۆڕن لێدان بە شاردا دەهاتن و وەك هێشووە ترێ کوڕ و کچ خۆیان پێ هەڵواسی بوو، دەیانگوت:

**ـ خاکی خۆمانە لێرە نارۆین لێرە نارۆین**
**ـ بژی مـــــــەلا دەڵگەیی**
**ئاواتمان بە جــــێ گەیی**
**تـــــــانك وتوپ تەیارە**
**دەرمان ناکات لەم شارە**

چەند زەلامی بە تەمەنم بینی لە غوربەت و خۆشی دەگریان، سێ زەلامم بینی لە سەر سەقفی قەمەرەیەك سوار بوون، بە خاوەن سەیارەکەم گوت:

ـ سەقفی سەیارەکەت قووپا جوابی دامەوەو گوتی:

ـ سەیارە چییە بۆ خۆشم بەقوربانی قەڵادزێ بم.

هەستتت دەکرد ئەم خەڵکە ئەم شارەی نەك هەرخۆشدەوێت بەڵکو دەیپەرستێت. چییە؟ ئەم هەواڵەی راگواستن لەسەر قەڵادزێ نەما لە کوێ بڵابۆوە؟ گوتیان: حەمە چکۆل تەلەفۆنی کردووە بۆ ژاراوە و هەواڵێکی ئاوای بڵاوکردۆتەوە. بۆ دڵنیا بوون لە هەواڵەکە، هەرچی سەیارە هەیە رووی لە ژاراوە کرد بۆ ماڵی حەمە چکۆل. تا درەنگانی شەو شایی و رەشبەڵەك بەردەوام بوو. لای رژێم ئەمە بە خراپ لێکدرایەوە، نەکا ئەم شایی و خۆشی دەربڕینە هەڵگەڕێتەوە و ببێت بە راپەڕین و خۆپیشاندان. بۆیە بە هێز بڵاوەیان بە خەڵك و بە سەیارەکان کرد. هەرچەندە زۆر لە گەنجەکان چەند وێنەیەکی صدام حسین یان پێ بوو کە گوایە بڕیارێکی لە بەرژەوەندی ئێمە دەرکردووە. نەفەرێکیان لە گەنجەکان بە ناوی **بەهمەن رەحمان سدیق** گرت و بردیان بۆ دائیرەی ئەمن. ئەم



هەواڵەش رۆژێکی پێ ژیاین و ئێوارە هیچ ئەنجامێکی نەبوو دیسان خەڵکەکە دۆشداما و خەم دایگرتەوە.

رۆژی ١٢ی نیسان کاتژمێر ١١ی پێش نیوەڕۆ، مەلا دەڵگەیی لە بەغدا گیرا. سەیارەیەکی جێب قیادەی عەسکەری دەچێ بۆ ئوتێل و رائیدێکی عەسکەری چەند جوندیەك سواری دەکەن و دەیبەن. ئەو شاندەی لەگەڵ مەلا دەڵگەیی بوون، ترسیان لێ نیشتبوو کە بۆچی چوون و چیان لێ بەسەر هات. رژێم وای لێکدا بۆوە کە مەلا دەڵگەیی دەستی لە دەربڕینی نارەزایەتی رۆژی پێشتری قەڵادزێ داهەبووە.

رۆژی ١٤ی نیسان بوو بە دەنگۆ گوایە پارێزگاری سلێمانی **شێخ جەعفەر** و **عەلی حەسەن مەجید** نەقڵ بوون، دڵمان پێ خۆش بوو. پێمان وا بوو ئەگەر تاوانبارێك نەقل بێت، کاری ئێمە بەرەو چارەسەری دەڕوات و پیاو چاکێك لە شوێنی دادەنێن.

رۆژی **١٢ نیسان ٨ رەمەزان** دوای **٣** کاتژمێر هەواڵی گرتنی مەلا دەڵگەیم بیست، من چووم بۆ ماڵی **سمایلی حاجی قادر** و بە کاك حەمیدی کوڕی کاك سمایلم گوت:

ـ تەلەفۆن بکە بۆ باوکت بزانم راستە مامۆستا گیراوە؟

کاك حەمید تەلەفۆنی بۆ باوکی کرد، کاك سمایل گوتی:

ـ درۆیە، ئەم قسەیە ئەسڵ و ئەساسی نیە. وا لەسەر بەرماڵ دانیشتووە خەریکی تەراویح کردنە. گوتم:

ـ کاك حەمید باوەڕناکەم، باوکت لەبەر ئێمە وا دەڵێ. بۆ ئەوەی خەڵك هیچ نەکات...

لە راستیدا ئەو وەفدەی لەگەڵ مامۆستا بوون، جگە لەوەی لە گرتنی خۆشیان دەترسان، لەوەش دەترسان گەنجەکان بە گرتنی مامۆستا بزانن و لە قەڵادزێ ئاژاوە و کێشە بنێنەوە.

تا گەیشتە ئەوەی لە رۆژی **٢٢** ی نیسان ئیزاعەی لەندەن باسی ئەو وەفدەی خەڵکی پشدەری کرد و، سەرۆك شاندەکە کە مەلا دەرگەڵەیی بوو، بە **رجل دینی محنك** ناوی برد و رایگەیاند کە گیراوە.

چەند کەسی خەڵکی پشدەریش لەسەر ئەو ئیزاعەیە قسەیان لە سەر ئەو بابەتە کرد. ئەمەش هەمووی دەرئەنجامی هەوڵ و تێکۆشانی خەڵکی پشدەر بوو کە هەوڵیاندا لە بەرامبەر دەنگی زوڵم و زۆرداری رژێم بەرامبەر بە ناوچەکە، دەنگیان بگاتە جیهان. لە راستیدا خەڵکی قەڵادزێ لە هەموو لایەکەوە هەوڵیان دەدا، قەڵادزێ لە شالاوی راگواستن بپارێزن. بەڵام ئەمانە هیچی پلانەکەی رژێمی هەڵنەوەشاندەوە. رۆژی (٢٣ نیسان) لیژنەکە لە ناو شاری قەڵادزێ کەوتە دابەشکردنی کارتی راگواستن. خەڵك بە ناچاری زۆر ئاسایی وەری گرت. رۆژی (٢٦ ی نیسان- ٢١ی رەمەزان) هەردوو کار بەدەستی رژێم **عەلی حەسن عامری** کە جێگای **علی حسن مجیدی** گرتبۆوە لەگەڵ **شێخ جەعفەر** هات بۆڕانیە و بێتواتە. چەند مەلا و پیاوماقولێك چون بۆ لای و لێی پاڕابونەوە کە ئەمساڵ وازمان لێبهێنن رامانننەگوێزن. مەلا محەمەدامین: بۆی گێڕامەوە گوتی دیار بوو علی حسن عامری بەزەیی پێدادەهاتین بەڵام دەسەڵاتی نەبوو. گوتی: وەڵڵا کاکە بەدەست من نییە بە دەست سید رەئیسە. خەڵك زۆر پێی ناخۆش بوو کە ئەوانە نەهاتبوون بۆ قەڵادزێ.

ئەوە ناوی هە ندێك لەو بەرێزانەیە کە چوون بۆ لای ئەو دوو کاربەدەستە:

- مەلا محەمەد ئەمینی مام قاسمە
- مەلا سەید ئەحمەد
- مەلا برایمی حەداد
- مەلا برایمی دێگە
- حاجی مەلا مینە
- دێوانەی دێگە
- چەند کەسی تریش

رۆژی (٢٧ی نیسان) وەفدی پیاوماقوولانی قەڵادزێ لە بەغداوە بە نائومێدی و دڵ پڕ لە غەم گەڕانەوە. (صدام حسین) یان نەبینی بوو و هیچیان بۆ نەکرا بوو. تاك تاك و جووت خۆیان کرد بە شاردا. لەگەڵ گەڕانەوەیان بۆ قەڵادزێ ئەم پێنج کەسەی



خوارەوە کۆبونەوەیەکی بە پەلەیان لە ماڵی سمایلی حاجی قادر ئەنجامدا. راوێژیان لەسەر ئەوە کرد کە (٣٠٠) سێسەت کەس پرچەك بکەن و بە سەرکردایەتی مەحمودی حاجی حەمە رەش و مەمەندی سەلیماغا، بیان نێرن بۆ شاخی **کورپیس** تا دژی رژێم چالاکی ئەنجامبدەن و، رژێم ناچار بکەن واز لەراگواستنی قەڵادزە بهێنێ. ئەم بیرۆکەیەش سەری نەگرت. باسی ئەویان کردبوو داوا لە حزبەکان بکەن بەچەك یارمەتیان بدەن، بەڵام بەم دەم ودەستە نەیاندەتوانی ئەم چەك و پارەو خەڵکە کۆبکەنەوە. بەرێزانی بەشدار لە کۆبوونەوەکە ئەمانە بوون:

- مەحمودی حاجی حەمەرەش
- حەمەی هەباساغا / چۆمخڕکە
- حەمەی کانەبیاغا
- سمایلی حاجی قادر
- شێخ حوسێنی بنەوشان

دواتر جارێکی تر لە رۆژی (٢٩ی نیسان) سمایلی حاجی قادر لەگەڵ مەحمودی حاجی حەمەڕەش چوون بۆ بەغدا تا واستەیەك بدۆزنەوە ملادەلگەیی بەرەڵڵا بکەن. لەو رووەوە مەحمودی حاجی حەمەڕەش نوسراوێکی جوانی نووسی بوو بۆ سەرۆك کۆمار، بەڵام بێ سوود بوو. ئەوانیش هیچیان بۆ نەکرا و گەڕانەوە.

رۆژی (٤ی ئایار) حەمە چکۆل جاشەکانی کۆکردەوە و داوای لێ کردبوون کە خانووەکانیان تێك بدەن، بەڵام جاشەکان کەسیان بە قسەیان نەکردوو ووتیان ئێمە لەگەڵ خەڵکەکەین.

رۆژی (٥ی ئایار) عەدنان خیرالله وەزیری دیفاع لە فڕۆکە کەوتە خوارەوە. لە هەموو شارەکانی عێراقدا پرسەیان بۆ دانا. لە قەڵادزێش پرسە دانرا. ریش سپی و پیاو ماقولان هانی خەڵکیان دا بەشداری پرسەکە بکەن. پتر لە (٥٠) پەنجا کەس چوون بۆ سلێمانی و بەغدا، بۆ ئەوەی هەلێکیان بۆ بڕەخسێ بتوانن سەدام ببین. نوسراوێکی جوانیان نووسی بوو دابوویان بە مەلا محەمەدئەمین کە بیدا بە سەددام و قسە بکات. مامۆستا بۆی گێڕامە وەگوتی فرسەتەم بۆ رێکەوت وتەوقەم لەگەڵ سەدام کرد.

پێمگوت ئێمەی وجەهاو عوللەمای دینی ناوچەی پشدەرین هاتووین سەرەخۆ شـیت لیّ بکەین، ئەم تەکلیف و داوایەشمان هەیە لیّمان قبولّ بفەرمووی. گـوتی نووسـراوە کـەی لێوەرنەگرتم، گوتی بیدە بە سید وەزیر. مامۆسـتا مـەلا **محەمـەد ئـەمین** گـوتی وەزیـر لەولاوە وەستا بووپێشوازی خەڵکی دەکـرد. ووتـی نووسـراوەکەم دایـە دەسـت وەزیـر و بەرێزیەوە لێی وەرگرتین. لەەویش زۆر پارامەوە کەلەمبارەوە هاوکاریمان بکات.

ئەو خەڵك هەژار و بێدەسەلاتە پێان وابوو بە بەشدارکرن لە پرسە و هەڵبژارن، ئەم رژێمە دڕندە و نەبیسە، نیازی گـلاوی خـۆی بەرامبـەر ناوچـەکە دەگـۆڕی و واز لـە راگواستن دەهێنیّ. لە ٧ی مانگ **عبدالجبار شنشل** بەپەلە کرا بە وەزیری دیفاع. رۆژی (١٨ی ئایار) سەرۆك جاشەکان بانگکران بۆ فیرقەی چوارقورنە و پێیان گوتبوون:

ـ برۆن خۆتان حازر بکەن بۆ بارکردن.

گوتیان هەموویان هەڵویستیان باش بوو، هەندێکیان قسەی باشیان کرد بوو تەنها گلەییان لە دوو سەرۆك جاش هەبوو گوایە بیّ هەڵویست ببوون.

رۆژی **٢٠ی ئایار** رژێمی عێـراق خێزانێکـی عـەرەبی زۆری بـە خـەتی سـونیّ دا دەرکرد بۆ ئێران، دەیانگوت ئەمانە خێزانی ئەو ئەو ئەفسەرانەن کە لە ئێـران ئەسـیر بوون و ناگەڕێنەوە بۆ عێراق.

رۆژی ٢٩ی ئایـار ـ ٢٤ی شـوال **سـیروان جـاف** پارێزگـاری سـلێمانی و **شـێخ جەعفەر** و **قائید فیرقە** هاتن بۆ قەڵادزیّ و، داوایان لە خەڵك کرد خۆیان بۆ راگواسـتن ئامادە بکەن. لە نیوە شەوی (٢٩/٣٠ ی ئایار دەوری ئۆردوگای **تووسووران** بە جـاش و عەسکەرو دەبابە گیرا و، بەیانی دەستیان کرد بە بارکردن.

کە کارت دابەشکردنیش دەستی پیّ کرد، گەنجی قـەڵادزیّ هـەر وازیـان نـەهێنا. رژێم داوای دەکرد خۆتان ئامادە بکەن خانووەکان تێکبـدەن تـا رابگـوازرێن. کەچـی گەنجەکان نەیاندەهێشت وورەی خەڵك بڕوخـێ و رێگـەیان نـەدەدا کـەس خانووەکـەی هەڵوەشێنیّ یا کەل ە پەل بار بکات. دەنگی یەك چـەکوچ بـە مەبەسـتی دەرهێنـانی دەرگا و پەنجەرە، لە هەر ماڵێك بهاتایە، نیوەشـەویش بوایـە گەنجـەکان دەگەیـشتنە



سەری و سەرکۆنەیان دەکرد. لە ترسی گەنجەکان کەس نەیدەوێرا بۆ سووك کردنی باری خۆشی هیچ شتێك بار بکات،.

مامۆستایەکی ئامادەیی بە ناوی **مامۆستا عەدنان** برادەری (**مامۆستا بایز**) بـوو زۆر دەمێك بوو داوای نەقلیّ کرد بوو بۆ سلێمانی. لەم ئان و ساتەدا موافەقەی نەقلیّ بۆ هاتەوە. پیکابی برد و دەستی کرد بە ماڵ بـارکردن. گەنجـەکان گەیـشتنە سـەری وداوایان لێکرد ماڵ بار نەکات چونکە خەڵك نازانیّ نەقڵ بووە، وا دەزانن باردەکـا و وورەیان دەڕوخیّ. ئەویش زۆر پیاوانە وازی لە بارکردن هێنا و گوتی:

ـ خۆم لەم خەڵکە جیا ناکەمەوە، چارەنووسی منیش وەك ئەو خەڵکـە. بەراسـتی ئەم هەڵویستەی جێگای رێز و ستایش بوو.

بەم شێوەیە دانیشتوانی قەڵادزیّ زۆر خۆڕاگر بوون تا دڵنیا نەبوون کە کار لـەکار ترازاوە و تازە هیچ ناکرێت، نەشتیان ماڵیان بارکرد نە خانوویان هەڵوەشاند.

رۆژی ٦ی حـوزەیران بـارکردن گەیـشتە شارۆچـکەی سەنگەسـەر. لـە ٧ی حوزەیران بە یـەکجاری وورەی خـەڵکی پـشدەر رووخـا. تـا ئەوسـاتەش خـەڵکی پشدەرهیوا و ئومێدیا لەدەس نەدا...

ئەو رۆژە ورەی خەڵك بە یەکجاری رووخا. خە ڵك هـەمووی دەسـتیکرد بـە خـانوو رووخاندنو ماڵ بار کردن. ئینجا خەڵکەکە کەوتنە گلەیی و گازندە لە گەنجەکان. گوایە خەتای ئەوان بووە نەیانهێشتووە باری خۆیان سووك بکەن. بەراستی دەرفـەت زۆر کـەم مابوو، هەندیّ کەس بەباشی فریای خانوو تێکدان و ماڵ بارکردن نەکـەوتن. خـەڵکێکی ئەوتۆ لەناو شار نەمابۆوە تا بتوانن لە ماڵ بارکردندا هاوکاری یـەکتری بکـەن. شـەوانە هەموومان لە کاولە خانووی ماڵێکدا لە دەوری چرایەك کۆدەبووینـەوە. چـونکە ئـاو و کارەبا نەبوو. حکومەت هەر زوو دایرە و فەرمانگەکانی خۆی گواستبۆوە. دائیـرەی ئـاو وکارەبای تێکدا و بە کاربۆن ستوونەکانی تۆڕی کارەبای بڕیەوە.

رۆژی ٩ی حوزەیران، **مەلا حوسێن** ئەخیر نوێژی هەینی لە جیاتی مەلا دەڵگـەیی بۆ ئەو کەسانەی لە ناوشار مابوون، ئەنجامدا. بـەرێزیان هۆنراوەیـەکی زۆر دڵنـشین و

نیشتیمانپەروەریی خوێندەوە. بە هۆنراوە ماڵئاواییی لە خاکی پشدەر و گۆڕستانەکەی کرد. خەڵکی خستە گریان.

هەر ماڵێك باری دەکرد، یەکسەر عەسکەریە بە بلدۆزەر دەکەوتە سەری و دەیانڕوخاند. هەر خانوویەك سەخت بوایە ئەوا بە (TNT) دەیان تەقاندەوە. لەولاشەوە پۆلێك کرێکاری میسری بە غازی کاربۆن ستوونی کارەبا و تەلەفۆنیان دەبریەوە. دیمەنێکی تابلێی ناخۆش و دڵتەزێن بوو.

ڕۆژی ٢٢ی حوزەیران ڕائیدێکی عەسکەری لەگەڵ چەند سەربازێك، تەکسی قادر سەعید یان بە سۆخرە گرتبوو، کۆڵان بەکۆڵان دەگەڕان، دەیانگوت بڕۆن لێرە مەمێنن دەنا دەگیرێن. تا ئەو سەروبەندە بە دەگمەن خەڵك لەناو شار مابوو.

ڕۆژی ٢٦ی حوزەیران بە ساڵڕۆژی ڕاگواستنی پشدەر دادەنرێت. لەم ڕۆژەدا دەروازەی پشدەر لە سەیتەرەی پشدەردا داخرا. هەر کەسێك بینرابا دەگیرا و ئەنفال دەکرا. پشدەر بووە ناوچەیەکی قەدەغە کراو (محەڕەمە). فڕۆکە جەنگی و هەلیکۆپتەر بە ئاسمانی ناوچەکەدا دەگەڕان. ئەومالانەی وولاغی باریان هەبوو و نەیانتوانی بوو لەگەڵ خۆیان بیبەن، بە ناچاری بەرەڵلای کردبوون. ڕژێم زۆر دڕندانە بە فڕۆکە کەوتە سەریان و هەموویانی کوشت. تەنانەت ڕوحمی بەو ئاژەڵە بەستەزمانانەش نەکرد.

برادەرێك کە لە یەکێك لە ڕەبییەکانی پشدەر سەرباز بوو، بە دەروونێکی پڕ لە کوڵی گریان، شتێکی زۆر سەیری بۆ گێڕامەوە، سوێندی خواردگوتی:

ـ پتر لە (٥٠) پەنجا سەگ و پشیلەم بینی کە دوو ئاژەڵی دژ بەیەك و نەگونجاون, بە یەکەوە لەمبەرو ئەوبەری جادەی قیر شوێن پێی خەڵکەکەیان هەڵگرتبو و بەرەو ڕانیە دەهاتن.

ڕۆژی ٢٨ی تەمووز کاری خانوو تێکدان کۆتایی هات. ئەو کەتیبە عەسکەریەی هاتبوو بۆ تێکدانی خانووەکان، قەڵادزێی بەجێ هێشتز و گەڕایەوە ڕانیە. بەڵام دوای، شەش ڕۆژ من ئەوکاتە لە ڕانیە بووم، هەمان کەتیبە گەڕایەوە بۆ قەڵادزێ و کەوتەوە تێکدانی قەڵادزێ. گوایە عەلی حەسەن مەجید بە فڕۆکە بە سەر قەڵادزێدا گەڕاوە، تێکدانەکەی بە دڵی نەبووە و فەرمانی داوە بگەڕێنەوە تەواو وێرانی بکەن.



دوای تێکدان ڕژێم ژێر سەقفە رووخاوەکانی پڕ کرد بوو لە مین، تا شەوانە پێشمەرگە خۆیان لەو کاولە خانووانەدا نەشارنەوە.دوای ڕاپەڕین خەڵك مینە چێنراوەکانی هەڵگرتەوە.

ڕژێم دوای ڕاگواستنی پشدەر، ڕژێم **مەلا دەڵگەیی** سواری سەیارەیەکی عەسکەری دەکا و بە سووکایەتی پێکردن بەناو قەڵادزێی کاولکراودا دەیگێڕێ. مزگەوتەکەیان نیشان دابوو، گوتبوویان ئەوە شارەکەتە و ئەوەش مزگەوتەکەتە و جارێکی تر ڕێگر نەبی لە بەردەم جێبەجێکردنی بڕیاری ئێمە.

بەرنامەی ڕژێم بۆ ڕاگواستن زۆر لەوە بەرفراوانتر بوو بەڵام هەنگاو بە هەنگا و درێژخایەن بوو. دوای ئەو هەموو هەوڵ و تێکۆشانەی بێ ئاکام مایەوە، زۆربەی شار باری کرد. لەو کات و ساتەدا هەواڵێکی خۆش هات. وتیان بروسکە کراوە تەعویزمان دەدەنێ. بۆ هەر خانویەك کە تاپۆی هەبێ ١٠٠٠٠ دە هەزار دینار و بۆ هەردوکانێکی تاپۆکراویش ٥٠٠ پێنسەت دینار. ئەم هەواڵەش مایەی خۆشحاڵی بوو. چونکە نیوەی خەڵکەکە بێ پارەی بوون.

حەزدەکەم لێرەدا شتێك بخەمە ڕوو: ساڵی ١٩٨٨ کارگەیەکی بلۆکم لە **وەستاکەریم** و **مەولودی ڕەسوڵ پالاخی** کۆیە کڕی. دوایی **عەلی حاجی حەمەدە** و **عەبدوڵا خەسرەوی** ڕانیە بوون بەشەریکم. لەبەر ئەوەی حکومەت بۆ قەڵادزە موافەقەتی نەکرد، چووین لە ڕانیە دایبمەزرێنین. شارەوانی ڕانیە لە پشت قاعە کانی کارگەی شەکرەکە، ٤٠٠٠ چوار هەزار مەتر زەوی نیشان داین و کتابیان بۆ کردین بۆ شارەوانی سلێمانی، لە سلێمانیش کتابیان بۆ کردین بۆ بەغدا. من وکاك عەلی و کاك عەبدوڵا خەسرەو بە سەیارەی کاك عەبدولا ڕۆیشتین بۆ بەغدا. خاڵە عەبە لە ڕێگا ئەوەندە قسەی خۆشی بۆکردین نەمانزانی چۆن ئەم ڕێگە دوورەمان بڕی. چووین دائیرەکەمان دوزییەوە نووسرابوو: هيئة تخطيط العمراني/ قسم تخطيط المدن. سەفاو مەروامان بە کتابەکە کرد تا گەیشتە لای مدیر. دوای ماوەیەك کتابەکە دەرچوو بە دەست فەراشەکەوە بوو، لێمان وەرگرت بە عەرەبی نووسرا بوو: **رفض الطلب بموجب قرار وزارة الدفاع — سري للغاية**

— **قصبة رانية. داخل شريط حدودي.** ئەگەر هەڵەنەبوبم و لە بیرم بێت وابزانم ژمارەی قەرارەکە ٤٧١٣ بوو. کە خوێندمانەوە زۆر تێکچووین. کتابەکە لەسەری نووسرابوو (**تحفظ**– واتە هەڵبگیرێ) بەڵام فەراشەکە نەیدەزانی چی لێ نووسراوە. کە کتابەکەمان وەرمانگرتەوە گورج دابەزین و چووینەوە بۆ ئوتێل. خۆمان کۆکردەوە و یەکسەر گەڕاینەوە. خاڵە عەبە بە درێژایی رێگا خەم دایگرتبوو و ئەو زەوقەی پێشووی نەما. ناو بە ناو جنێوی دەداو لەبەر خۆیەوە دەیگوت ئای لەم گەوایانە نیازیان چەند خراپە.

دوایی لە سلیمانی بە ناچاری، بە زەرەرێکی زۆر فرۆشتمان بە علی بۆسکانی. ئەمە مانای ئەوەیە، ئەگەر ئەو رژێمە بمابا، شاری رانیەشی بە مەردی ئێمە دەبرد. سەیرتر ئەوەیە: حکومەتی هەرێمی کوردستانیش ساڵی ٢٠٠٣، نوسراوی بۆ عومەری کوڕی عەبە خەسرەو نارد بوو بچێت زەریبەی ئەم کارگەیە بدات. ئەویش هاتە لای من، گوتم ئێمە بە شێوەی یاسایی فرۆشتومانە، جگەلەوە رێگەیان نەداوە دایبنێین. ئەوانیش کاك عومەریان زۆر ماندو کرد تا وازیان لێ هێنا. عەبدوڵڵا خەسرەو پیاوێکی تابلێی سەخی، دڵ فراوان و نیشتمان پەروەرێکی بێ وێنە بوو. هەزار رەحمەتی لێ بێت، بە رای من نمونەی پیاوی ئاوا کەمن...

دوای ئەوەی عێراق کوێتی گرت و سزای ئابوری خرایە سەر، رژێم بۆ چارەسەر کردنی ئەم کێشە ئابوریەی تووشی ببوو، داوای لە جوتیارەکانی ئۆردوگا زۆرەملێکان کرد، بچن زەویەکانیان بکێڵن و بیکەن بە دەغڵ و دان. ئەو جوتیارانەی زەویشیان نەبوو، بەناوی زەوی کێلانەوە دەچوون ناوچەکانی خۆیان جارێکی تر ببیننەوە. دروێنەوەی ئەم دەغڵ و دانە کەوتە ناو رۆژەکانی راپەڕین. رژێمی عێراق دەسەڵاتی بەسەر کوردستاندا نەما. هەرچی کوڕو کچی قەڵادزێ هەبوو لە ئۆردوگا زۆرەملێکان، کاسێتی گۆرانی **شاکارەکەی خۆی** مامۆستا مەزهەری خالقی یان لێدەدا کە دەڵێ:

**دوژمن پێی خۆش بێت یا پێی ناخۆش بێت**
**دەگەڕێمەوە وڵاتەکەی خۆم**

# چارەنووسی پشدەریەکان دوای ڕاگواستن

بەم شێوەیەی باسکرا پشدەر ڕاگوێزرا. بەڵام با بزانین بۆ کوێ یان بارکردین؟ لە ڕاستیدا هەر کوێیەکت داواکردبا، سلێمانی یا هەولێر بە ئارەزووی خۆت بوو. زۆربەی خەڵکی قەڵادزێ ناوی خۆیان بۆ پارێزگای هەولێر نووسی. بەداخەوە ئەوکاتە ناووناتۆرەی خراپ بڵاودەکرایەوە، کە وتەی دەمی کەسانی نەفام و خۆرکەی ناودڵی کورد بوون.

چەند ماڵێك نەبێت، تێکرای دانیشتوانی پشدەر خۆی بۆ هەولێر نووسی. دواییش پەشیمان بوونەوە بۆ سلێمانی، چونکە بۆ ئێمەی پشدەری، سلێمانی لە هەموو ڕوویەکەوە باشتر بوو. سروشتی ناوچەکە خۆشتر و ئیدارەی حکومی و خەڵکەکەی زۆر ڕێزیان لێ دەگرتین. دەیانزانی خەڵکی پشدەر چەند خۆڕاگر بوون و هەوڵیانداوە ڕانەگوێزرێن.

بە سەر پارێزگای هەولێر و سلێمانی دا دابەش کراین. لە سلێمانی کراین بە سێ ئۆردووگای نزیك یەکتری:

- مدینە صدام ١. واتە بازیانی یەك
- مدینە صدام ٢. واتە بازیانی دوو
- باینجانە.

بەداخەوە ئاغاو جووتیار لەوێش ڕەنگی دایەوە. هەردوو لا، بێ ئەوەی هیچ لە گۆڕێ مابێ و کەس خاوەنی یەك مەتر زەوی بێت، خۆیان لەیەك جیا کردەوە. هەمووی وەك یەك ٢٠٠م زەویان پێدابوون. جووتیارەکان خۆیان بۆ **مدینە صدام ١** نوسی و ئاغاکان بۆو لەگەڵ چەند ماڵە قەڵادزێییەکی تر بۆ **مدینەصدام ٢**. ڕژێم تۆوی کینە و دووبەرەکی لە نێوان خەڵکدا دەچاند. بۆیە ئەم دووبەرەیە لە



ئۆردوگاش یەکتریان خۆش نەدەویست و دژایەتی یەکتریان دەکرد. بەشەکەی تری خەڵکیش خۆی بۆ هەولێر نووسی. لەوێش بەسەر **٥ پێنج ئۆردوگا** دا، دابەش کران. بە گشتی خەڵکی دەڤەری پشدەر بە سەر ٨ هەشت ئۆردوگادا دابەشکران. لە هەولێر ئۆردوگاکان بریتی بوون لە:

- ئۆردوگای خەبات.
- ئۆردوگای کەورگۆسك.
- ئۆردوگای جەدیدە
- ئۆرددوگای تۆپزاوا.
- ئۆردوگای دارەتوو.

ئەو خەڵکەی کەوتە هەولێر، لە ناو پەرێزەگەمان بێ خانوو و بێ نوا بێ ئاو وکارەبا فڕێدرابوون. بە قرچەی گەرمای هاوین، تەپوتۆز و بای خۆڵاوی، چەند منداڵ و پەککەوتە شەهیدبوون. لەلایەکی تر ڕاو ڕاوێنی پیاوانی ڕژێم بۆ بە سەرباز گرتنی گەنجەکان و بەساڵاچوان بۆ جەیشی شەعبی بەردەوام بوو. ئەوماڵانەی بەر ئۆردوگاکانی سلێمانی کەوتبوون لە ناو قوڕقاڵ و دێبەرە تەماتەی خەڵکی هەژاردا فڕێدرابوون. خەڵکی ئەو ناوچانەی ئوردوگاکانیان لێدامەزراند بوو، هەموویان زەرەرمەندبوون و بەرهەمی کشتوکاڵیان هەمووی فەوتا. لەبەر ئەوە خەڵکی گوندەکانی ناوچەی بازیان کە زەویەکانیان بەر ئەو ئۆردوگایانە کەوتبوو، خۆشیان نەدەویستین. تا تێکەڵاویمان پەیدا کرد و لەگەڵ یەکتری ئاشنا بووین، هەر دەیانگوت جاشە پشدەریەکان بۆ سوتاندنی گوندەکانی ئێمە پێش ڕژێم کەوتوون...

سەرەڕای ئەم ناخۆشیانەی خەڵکەکە تێی کەوتبوو، هەرچی گەنج بوو کردیانن بە سەرباز، ڕێگەی ڕاکردنمان نەما بوو وەك پشدەر بۆمان نەدەلوا. پیاوانی ڕژێم بە ماڵاندا دەگەڕان بەساڵاچوەکانیشیان دەگرت و دەیانکردن بە جیش شعبی. ئەگەر هیچ نەبوایە گێچەڵیان پێ دەکردن تا پارە بدە بۆ ڕزگار کردنی خۆیان و نەکرێن بە جیش شعبی. زەلام هەبوو چەند جار خۆی بە پارە کڕیبۆوە.

زۆربەی بەساڵاچوان، لە ترسی مەفرەزەی ئەمن و جیش شعبی بە مانگ نەیاندەوێرا لە ماڵ بێنە دەرەوە، چونکە یەکسەر جلی جیش شعبی و چەکیان دەدانێ بێ مووچە و خواردن، دەیان بردن بۆ بەرەی شەڕی کوێت. لەوێش لە رۆژانی کۆتایی شەڕدا، لە جیاتی هەموو خواردنێك تەنیا یەك پەرداخ ئاردیان دابوونێ پێی بژین. ژیانی ئۆردوگاش دیار بوو. سەرەڕای ئەم هەموو ناخۆشیانە و غوربەتی و دووری لە زێدی خۆیان دەبێ ژیانی ئەم خەڵکە لەو چۆڵەوانییە چۆن بووبێت؟!.

قەڵادزێییەکان زۆربەیان لەسەر ئارەزووی خۆیان کەوتنە ئۆردوگای **خەبات**. شوێنەکەیان تا رادەیەك باشتر بوو، چونکە ئوردووگاکەیان لە کەناری **زێی گەورە** بوو. ژیانێکیان بەم رووبارەوە بوو. ژیانی رۆژانەی گەنجان تەنیا سەر رووبار بوو. چەند لاوێکی قەڵادزێی لە رووبارەکەدا خنکان. بۆ کۆنترۆڵکردنی، ئەم شوێنە بۆ رژێم باش بوو. لایەکیان ئاوەکە بوو، لە سەرووی رووبارەکەش **عەشیرەتی هەرکی** لێ بوو کە هەموویان چەکدار بوون. لایەکەی تر خەڵکی **دیبەگە** بوون، ئەوانیش لەسەر جادەی گشتی هەولێر موسڵ بوون و بە ئاسانی لە لایەن رژێمەوە کۆنترۆڵ دەکرا. دیار بوو ئەم شوێنە پێشتر بۆ دانانی ئۆردوگا بە باشی دراسە کراوە.

ئەوەی جێگای شانازییە، لەوێش خەڵکی قەڵادزێ زۆر باش پشتی یەکتریان گرتبوو. وەك برا پشتیوانی یەکتریان دەکرد. خەڵکی تر خۆی لێ دەپاراستن، تەنانەت جاشە چەکدارەکانی ناو عەشیرەتەکانی ئەو ناوەش نەیاندەوێرا زوڵمیان لێبکەن. دەیانزانی دەست دەکەنەوە و لە کەس قبوڵ ناکەن. لە مانگی ٥ی ١٩٩٠ لە ئۆردوگای دارەتوو مەفرەرەزەیەکی طواریء و جەیشی شەعبی چوو بوون بۆ گرتنی خەڵك. سەرەتا چووبوونە ناو کەرکوکیەکان. خەڵکیان زۆر ئازار دابوو کەس متەقی نەکردبوو. بەو هەوایەش هاتبوونە ناو قەڵادزەییەکان. بەڵام خەڵك لێیان رادەپەرن، دوای تێهەڵدانێکی باش چەکیان کردبوون و چەکیان دەکەن. رۆژی دوایی کەرکووکیەکان بە مەفرەزەکەیان گوتبوو ئەوەی لێرە دەیکەن ئەگەر پیاون لەناو قەڵادزەییەکان بیکەن.



من ماڵم لە سلێمانیە بوو کاتی شەڕی کوێت بە سەڵتی هاتم بۆ بازیانی ٢. رۆژانە دەماندیت جەیشی عێراقی لە راست هێزی ئاسمانی هاوپەیمانان چەند زەلیل و بێ دەسەڵات بووە. فروکەی هاو پەیمانان رۆژی چەند جار بۆردومانی ناو عێراقیان دەکرد. کە فرۆکەی هاوپەیمان لە ئاسمان نەدەمان، فرۆکەی عێراقی زۆر بەنزمی بەسەر دۆڵی بازیاندا بەرەو ئێران رایان دەکرد. خەڵکی دۆڵی بازیان دەیانکرد بە هەراو گاڵتەجاڕی. رژێمی عێراق لە هەموو روویەکەوە بەرامبەر هیزی هاوپەیمانان زۆر لاواز و زەلیل بوو. بەبۆچوونی هەموو کەس دەزانرا بەگژداچوونەوەی رژێم و راپەڕین  روودەدات. ئیزگەکانی شۆرشیش داوایان لە خەڵکەکە دەکرد، خۆیان رێك بخەن، ناکۆکییەکانیان بنەبڕ بکەن، شانەی چەکداری دروست بکەن وخۆیان ئامادە بکەن بۆ راپەڕین. لە هەموو روویەکەوە زەمینە لەبار ببوو. کەس نەبوو لەکوردستان بە کەڵپی رژێمی بەعس زامدار نەبووبێ، لەوانە خەڵکی ناوچەی پشدەر. پشدەر وەك زۆربەی ناوچەکانی تری کوردستان، ئەوەندە ئازار و ئەشکەنجەی لە دەست ئەو رژێمە زۆردارە چێشتبوو، ئەوەندە زوڵم و ستەمی لێکرابوو، رۆژژمێری دەکرد تا هەلی بۆ رێکبکەوێ تۆڵەی خۆی لەم رژێمە بکاتەوە. زەمینەی راپەڕین بەتەواوی رەخسا بوو. من و کاك **ئەیووبی سۆفی عەولا** کە ئێستا کارگێڕی مەڵبەندی (٢٤)ە، لەگەڵ کاك **مەمەندی بایزاغا** کە ئێستا حاکمە لەئەنجوومەنی وەزیران، دانیشتنێکمان لە ماڵی بەختیاری برام کۆبووینەوە تا بۆکاتی گونجاو خۆمان ئامادە بکەین. رۆژانە ئاگامان لە یەکتر بوو، بڕوامان وابوو کاتی راپەڕین هاتووە. کە هێرشی **گەردەلولی بیابان** لە کوێتەوە دەستییپێکرد، سوپای عیراقی ئەوەی مابوو بەپرتاو بۆ خۆ دەرباز کردن بەرەو ناو خاکی عێراق رای دەکرد. هەر ئەو سوپایەی لە کوێت رایکردبوو بینیمان چۆن لە داخان  لە بەصرا وێنەی صەدامی دایە بەر تۆپی تانك و، چۆن خەڵکی باشووری عێڕاق راپەڕین و دەستیان بەسەر تێکڕای دام و دەزگاکانی رژێم داگرت و، هەر بەعسییەکی تاوانبار کەوتە بەردەستیان کوشتیان. تا دەهات زەمینە بۆ راپەڕین لەبارتر دەبوو. پیاوانی رژێمیشی بێ ئومێد ببوون و ورەیان بەردابوو. هیوایان بە

مانەوەی رژێم نەمابوو. بۆیە دەیانویست جارێکی تر بگەڕێنەوە ناو ئەو خەڵکەی نەفرەتی لێدەکردن. لەبەر ئەوە دەمانتوانی بەراشکاوی قسەیان لەگەڵ بکەین.

رۆژی ٣/٤ کاك ئەیوبی سۆفی عەبدوڵا لە هەولێر بوو، کە گەڕایەوە بازیان بینیم زۆر پەشۆکاوە. گوتی ئەمڕۆ بەیانی لە ئۆدوگای خەبات راپەڕینێکی خوێناوی بووە. قەڵادزەیەکان راپەڕیون و ٢ کەسیان لێ شەهید بووە. یەکیان قەڵادزەییە بەناوی **بەختیار هورێوەیی** و ئەویتریان دیبەگەییە. گوتی بارودۆخەکە زۆر خراپ تێکچووە. خەڵکەکە هەمووی دامەزراوە بۆ شەر. برایمی کانەبی باڵوڵ ئاغا، عەمباری چەکی شکاندووە و چەکی داوەتە دەست خەڵك و گوتویەتی تازە قەوما. من و کاك ئەیوب و کاك مەمەند بە پەلە کۆبووینەوە تا بریار بدەین چیبکەین. کاك ئەیوب گوتی ئەگەر لێرە شتێك نەکەین، هەموو کەسوکارمان لە خەبات ئەنفال دەکرێن. راوێژمان لە سەرئەوە کرد کە ئایا دەتوانین ئێمەش لێرە راپەرین؟ کاك مەمەند گوتی بەرەئی من جارێ راپەڕین بۆئێرە زووە، چونکە شوێنەکەمان زۆرخراپە، لەنێوان دوو پارێزگا داین، لە ژێر دەستی کەرکوکین. گوتی: پێم باشە هەر ئێستا یەکێکمان بچین بۆ رانیە خەڵکێك ببینین بزانین ئامادەباشی خەڵك لەوێ چۆنە؟. رووی تێکردم و گوتی: پێیم باشە تۆ بچی. بەیانی زوو بەرەو رانیە وەرێکەوتم. لە گوندی **کانیماران نزیك قوتابخانەکە** گوێم لە تەقوتۆق بوو، بەلام نەمزانی چیە؟ کە گەیشتمە سەیتەرەی **چوارقورنە**، بینیم سەیتەرەکە نەماوە. دابەزیم بینیم خەڵك بە چەکی **بی. کەی. سی.** بە دار و تایەی سەیارە رێگایان گرتووە. ئینجا دڵنیا بووم راپەڕینە. زۆر دڵم خۆشبوو. لەکاتی گەڕانەوەمدا لە **گردجان** هێزێکی حکومەتم بینی وەستابوو. **قاسماغای** کۆیە، نەقیبێکی عەسکەری و نزیکەی (٥٠) پەنجا جاش و سەربازیان لەگەڵ و زرێپۆشێك و تۆپیکی ١٣٠ ملمیان پێ بوو. نەقیبەکە لەسەر پشتی زرێپۆشەکە بە پێوە بە دوور بین سەیری حاجیاوای دەکرد. قاسماغاش لە خوارەوە بە دوور بین دەیراوانی. سەرباز و جاشەکانیش خەریکی تۆپەکە بوون دایاندەمەزراند. من پێم وابوو بەنیازی تۆپ بارانکردنی حاجیاوان. لەکاتی گەڕانەوەمدا سەیتەرەکان



زانیبوویان و پرسیاریان لێدەکردین. ئێمەش بەزیادەوە بۆمان دەگێڕانەوە. دیاربوو زۆر دەترسن. بە پەلە بەرە و بازیان گەڕامەوە. پێش ئەوەی بگەمەوە **بازیانی دوو**، لە **بازیانی یەك** لامداو چومە ماڵی دێوانەی دێگە و، بارودۆخەکەم زۆر بە زیادەوە بۆ گێڕایەوە. گوتم: لە کۆیە و دوکانیش دەستیپێکردووە. مام دێوانە زۆری پێخۆش بوو. گوتی ئێستا دەڵێی چی؟ گوتم خۆتو وخزمان ئامادە بن. بەیانی زوو ناوی خوای لێدێنین. خوا هەڵناگرێ گوتی هەر لە ئێستاوە بە خۆم و کورەکانم و کەسوکارم چیم پێدەسپێرن تابیکەم؟. هەندێك فیشەك و چەند نارنجۆکێکم لێوەرگرت. ئەو رۆژە باران بوو خەڵکەکە زانی بووی راپەرین دەستیی پیۆکردووە،. پۆل پۆ ل لەبن دار و دیواری بەردوکانی ناو بازاڕ وەستابوون. هەر سرکەوکورکەیان بوو کەس نەیدەوێرا بە ئاشکرا قسە بکات. گەڕامەوە بازیانی دوو. پێش ئەوەی بچەمەوە ماڵێ، لە ماڵی کاك مەمەند لامدا. کاك مەمەند لە ماڵەوە نەبوو. کاك خدری برای لە ماڵ بوو. گوتی: چ ئیشێکت پێیەتی؟ گوتم: زۆر بەپەلە و پێویستە ئێستا بیبینم. هەر کە گەیشتمە ماڵەوە و حاکم مەمەند گەیشتە لام. لەگەڵ گەیشتنی حاکم مەمەند ماڵێ باوکم لە سلێمانیەوە هاتن بۆ سەردانم. بەخێرهاتنی دایکم و باوکم کرد و بە جێمهێشتن. لەگەڵ حاکم مەمەند چوومە ژوورە و دەرگام داخست. دایکم زووهەستی کرد. گوتی: رۆڵە ئێمە بۆ لای تۆ هاتووین وەرە لامان دانیشە. گوتم: دایە برۆنەوە بۆ سلیمانی بەیانی خۆم دێم بۆ لاتان. دایکم زانی شتێکم لە ژێر سەردایە، چونکە لەسەر من رەزاڵەت و گرتنیان زۆر دیبوو. گوتی تو خوا لێرەش بەگرتنمان مەدە خوالێیت هەڵناگرێ!. بارودۆخەکەم بۆ حاکم مەمەند بە زیادەوە گێڕایەوە، گوتی: ئیوە دەڵێن چی؟ گوتم: بەیانی زوو ناوی خوای لێدێنین. گوتی: زوو نییە؟ گوتم: کاك مەمەند دوادەکەوین گوتی: کاك ئەیووبت دیووە؟ ئەو دەڵێ چی؟ گوتم ئەو رازیە و رۆیشتووە ئیشی بۆ بکات. گوتی کەواتە درەنگە با ئیشی بۆ بکەین. کە هەستا گێڕامەوە، گوتم من ترسم لە حوسێنی حەمە سووری هەیە. دەترسم لێمان بدات. گوتم: خزمی خۆتانە پێم باشە بچی بۆلای قسەی لەگەڵ بکەیت. حاکم مەمەند گوتی: مەترسە ئەو لە ئێمە

باشترە، لەمێژە قسەی لەگەڵ کراوە. ئەوە عایدی من بێت. بە راستی من درۆم لەگەڵ کاك مەمەند کرد. کاك ئەیوبم نەدیبوو دواتر چاوم پێی کەوت. لای ئێوارە رۆیشتم چەند کەسێك ببینم و پێیا رابگەیەنم. لە ناو بازاری بازیانی ٢ رووبەڕوو تووشی حوسێنی حەمە سور بووم. نەمتوانی خۆمی لێ لابدەم، لە راستیدا زۆر ترسام. بەڵام من بۆ چوونم هەڵە بوو، وەستا و زۆر بەرێزەوە سلاوی لێکردم و، بەپێکەنینەوە گوتی ئەمرێك کارێك، نەتگەیەنم؟ تێیگەیشتم کە قسەی لەگەڵ کراوە. بەیانی کاك ئەیووب خەڵکێکی لەگەڵ بوو چوونە سەرداموودەزگای ئۆردوگای باینجانە و دەستی باشیان لە پیاوانی رژێم وەشاند. منیش ئەو چەند گەنجەی هەقە ناویان بهێنم چونکە سەرەڕای ئەوەی ئەنجامی راپەڕین بۆکەس ئاشکرا نەببوو زۆر باش بە دەنگمەوە هاتن. ئەوگەنجە بەڕێزانە بریتی بوون لە:

١- ئەردەلان وەستا عەلی
٢- کوڕەکانی حەمە عەسکەر
٣- ئەحمەد سۆفی عەبدوڵا
٤- ئەحمەد محەمەد بابەکر
٥- خدری عەبدوڵای پوور شەمامێ
٦- براکانی خۆم
٧- قادری مام کەریم

نزیکەی(١٥) کەس دەبووین. داوام لە دوو کەسی تریش کرد لەگەڵمانبێن، بەداخەوە نەهاتن، چوونە ژووری ماڵە وە و دەرگایان لەسەرخۆیان داخست. ناویان ناهێنم نەك ئەمڕۆ بەرپرس بن!. بەهەرحاڵ بە وتاف لێدان هاتینە ناو بازاڕ. ئەم ئۆردوگایە هیچ داموودەزگایەکی رژێمی لێنەبوو تا بچینە سەری. خەڵکەکەی ناوبازار گوتیان چی رویداوە؟ گوتمان: چۆن ئاگاتان لێ نییە؟ هەموو کوردستان ئازاد بووە تەنیا ئێمە ماوین. گوتیان ئەی ئێمە چی بکەین گوتم: تەقە بکەن. دوو دەستڕێژیان بە هەوادا کرد. وەك لە بیرم بێ **عەلی ئەحمەد ئاغای رەئیس** و **حاجیاغای بێشیر** بوون



تەقەکەیان کرد. لەگەڵ دەنگی دەسڕێژەکان، هەرچی چەکی هەبوو هاتن بۆ ناوبازاڕ، وایانزانی شەڕە! بێگومان ئاگادار کرابوونەوە، چوونکە حوسێنی حەمەسوورو حاکم مەمەند و حەسەن ئەحمەد ئاغا، ئاگادار بوون. هەموویان کەسوکاری یەکتری بوون. بەڵام لە چ رێگایەکەوە ئاگادار کرابوون نازانم. تەنیا من بە حاکم مەمەندم گوتبوو. خەڵکەکە گوتیان چی بکەین؟ گوتم: با بچین رێگەی کەرکوك بگرین. رێگاکە نزیکەی ٢ کم لە ناو با زاڕ دوور بوو. ئەو خەڵکە هەمووی پێکەوە بە راکردن، بەو باران و رەهێڵەیە رووماں کردە سەر جادەی سەرەکی کەرکوك سلێمانی. گروپی نەخۆشخانە هاتنە سەر رێگامان. یەك لەو کارمەندانە عەلی مەلا مەجید بوو. گوتی: ئێمەش لە ئێستاوە لە ئامادەباشی دادەبین، نەك بریندارتان هەبێت. رێگاکە تۆزێك سەرەولێژ بوو. لە سەر رێگای کەرکوك دوور بەدوور خەڵك دیار بوو. پێش ئەوەی بگەینە سەر جادەکە، چەند سەیارەیەك وەستان تا بزانن چی روویداوە و، بەو تۆفان و رێژنەی بارانە ئەم خەلکە بۆ کوێ رادەکەن. کە گەیشتینە سەر جادە، جادەکەمان بە بەرد گرت و داوای هە ویەمان کرد و گوتمان: کێ عەرەب و کێ پیاوی حکومەتە خۆی بناسێنێ. نەفەرەکان زۆریان پێخۆش بوو. دوو پاسی پڕ لە قووتابی وابزانم لە سەفەری قوتابخانە دەهاتنەوە. لە خۆشیان دەیانەویست دابەزن بە شداری بکەن. پێمان گوتن بەیانی نۆرەی ئێوەیە بتانبینین! ئەوا ئێمە رێگامان گرتووە. لەو کاتەی هەویەمان وەردەگرت. گوتیان جەیش هات رێگەماندا سەیارەکان بڕۆن. سەیارەیەکی عەسکەری دەرکەوت جەماعەت تەقەیان لێکرد، کەچی سەرنشینانی سەیارەکە هیچ بەرگریان لە خۆیان نەکرد. تانکەرێکی پڕ بە نزین بوو، ملازم ئەوەلێك و سەربازێك بوون. دەمانچەیەك و کلاشینکوفێکیان پێبوو. عوسمان داود دەمانچەکەی لە ملازم ئەوەلەکە ستاند و، خدری عەولای شەمامیش پڕی بەتفەنگەکەدا کرد. جاشێکمان لەگەڵ بوو بە ناوی **برایمە چکۆل** زۆر هەولی دەدا ملازمەکە بکوژێ. دەیگوت گوناح و شتی وا نازانم، ئەوەی بە **نان بلی خبز** دەیکوژم. ئێمە نەماندەهێشت و زابتەکەش دەپاڕایە وخۆی دەخستە پشت من. دەیگوت: وەڵلا مامۆستای ئامادەیی بووم،

کردوویانم بە سەرباز و (٤) مندالّم هەیە، توخوا مەمکوژن. من هەرچۆنێك بوو نەمهێشت بیکوژێ. ئێستاشی لەگەڵ دابێت نازانم چۆن تانکەرە بەنزینەکەیان دزی، تا ئاورمدایەوە نەمابوو. ئەوندە دەزانم دوو کوڕی قەڵادزەیی بوون بە جێیان هێشتین.

ئەوەی دێتەوە بیرم: **رەسوی حەماغای حەسارێ** و **عەلی حەماغای حەسارێ** و **عەلی بابەکری وەسمان ئاغا** و **ئەحمەدی حەمە مەروەیی** رۆلێکی باشیان هە بوو باش هەڵدەسوڕان. ئێمە لەم ئۆردوگایە ژن و مندالّمان لەگەڵ نەبوو. هاوکات لەگەڵ ئێمەش دانیشتوانی **بازیانی یەك** هاتبوونە سەرجادە و رێگەیان گرتبوو. بەڵام زۆر ئاگامان لە یەکتری نەبوو. کۆپتەر هات هەندێك ساروخی سرەواندە دەورەبەری جادەکە. خەڵکەکەش لە ترسان جادەکەیان بەجێ هێشت. کەچی **حاجی شەریف چەکوانی** بە تفەنگی برنۆ تەقەی لە هیلیکۆپتەرەکە دەکرد. خەڵکەکە زۆر دەترسان، گوێم لێ بوو جنێۆیان پێدەداین. هەندێ کەس لە ترسان ئۆردوگایان بەجێهێشت و چوون بۆ شاخەکەی پشت بازیان.

مرۆڤ دەبێ لە گێڕانەوەی مێژوودا زۆر بە ویژدان بێت. ئێستاشی لەگەڵ دابێت من حوسێن حەمە سورم خۆشنەویستووە و بەپیاوی چاکم نەزانیوە، بەڵام بە راستی دەورێکی زۆر مەردانەی هەبوو، زۆر بەبێ منەتی لە راپەڕیندا دژی رژێم شەڕی دەکرد. ناوبراو لەگەڵ **حەسەنی ئەحمەد ئاغا و حاکم مەمەند** رەبایەکانی دەوروپشت وسەیتەرەکەیان هەموو پێچاپەوە. حوسێن حەمەسور دۆشکەیەك و سەیارەیەکی جێب قیادەی داینێ گوتی بۆخۆتان بەکاری بهێنین. سەربازە گیراوەکان فێریان دەکردین چۆن دۆ شکەکە بەکار بهێنین و بۆشیان تاقی کردینەوە. گوێمان لەئیزگەی شۆڕش بوو بانگەوازی بۆ خەڵکی سلێمانی دەکرد تا رابپەڕن. هاواری دەکرد رۆژی ٧ ی مانگ رۆژی زەماوەندە. زەماوەند بکەن. زۆر خۆشحاڵ بووین. لای ئێوارە خەڵکێکی زۆر کۆببوینەوە حوسێن حەمە سوریشمان لەگەڵ بوو. من بە حوسێن حەمە سورم گوت باشە ئەگەر سلێمانی رانەپەڕی، ئێمە لێرە چیبکەین؟ هەمووومان تیدادەچین. حوسێن گوتی: ئەوە دەڵێی چی، خەڵکی سلێمانی لەو رۆژە دەگەڕان. دەیبینی چۆن رادەپەڕن و چیدەکەن. گوتم ئەوە قسەیە و دەیکەم! ئەگەر نەیانکرد چار چییە؟ وەڵامێکی ئەوەندە سەیرو بێمنەتی دامەوە، گوتی: ئێمەش هەموومان وێکڕا پانەوپان خۆمان بە سلێمانیدا دەکەین و بە سەریاندا فەرز دەکەین.

رۆژی **٧**ی مانگ خەڵکی سلێمانی راپەڕین. فڕۆکەی جۆری پلاتۆف بەسەر بازیاندا روی لە سلێمانی کرد تا بە هانای دامودەزگا سەرکووتکەرەکانیەوە بچێ. بەڵام لە دۆڵی بازیان لە هەموو لایەکەوە، تەققەیان لە فڕۆکەکە کرد و ناچاریان کرد بگەڕێتەوە. دوای راپەڕینی سلێمانی من و کاك ئەیوب و **مستەفای عومەر هیرۆیی**، چووین بۆ سلێمانی. سەرەتا چووین بۆ ئەمنە سورەکە. بەلامانەوە زۆر خۆش بوو. وەك داری قەڵاشکەری لاشەی پیاوانی رژێم بە سە ریەکدا کەوتبوون. من لە ناو کوژراوەکاندا، **ملازم جاسم و محەمەد ئەمین عەبۆی**، کۆنە قائیمقام ومدیر ئەمنی قەڵادزێم ناسییەوە. مندالێکی دەدوانزدە سالّەم بینی کوژرا بوو. دیار بوو کوڕی بەرپرسێك بوو لە ترسان لەگەڵ خۆی برد بوو. زۆر بەزەیم پێداهات، زۆر رووت بوو. بە بەتانیەکی نیوە سووتاو داپۆش. پیاوێکی بەتەمەن گوتی دیارە بەزەییت پێدادێت؟ گوتم: بەلێ ئەوە مندالە بێتاوانە هیچی لەسەر نیە. پیاوەکە گوتی راست ئەکەیت مندالە و بێتاوانە بەڵام بێچوی گورگە، گەورە بوایە هەموومانی ئەخوارد!. دوایی چووین بۆ گەڕەکی توی مەلیك بۆ قووتابخانەیەك بەناوی قووتابخانەی عەلی کەمال. هەرچی دانیشتوانی سلیمانی هەیە لەوێ بوو. هەموویان چەکدرا بوون. پۆل پۆل سەربازی دیل کراویان دەهێنا. هەر پۆلێك بە پتر لە٨٠ دیل مەزندە دەکرا. ژوورێکی بچوك لە پێشەوە بوو تێکرا رووومان تێکرد. ملازم عومەر بە پێوە راوەستابوو. ئۆقرەی لێهەڵگیرابوو، دانەدەنیشت. ئێمەی نەدەناسی، بەڵام دیار بوو کاك ئەیوبی دەناسێ. کاك ئەیوب ئێمەی بە ملازم عومەر ناساندن، خواهەڵناگرێ ئەویش زۆر رێزی لێگرتین. جیهازێك لە ناوپەنجەرەیەکی بچووکی ژوورەکەدا دانرا بوو بەردەوام بروسکەی پێدەکرد. ئەوەی لەوێ بوو هەمووی بە پێوە بوو. ملازم عومەر وەك هەلوك هەڵدەسوڕا دانیشتنی نەبوو پەیتا پەیتا هەواڵی دەدا بە عەدەد جهازەکە وقسەشی

لەگەڵ خەڵکەکە دەکرد. لەو کاتەدا **سالار و شاسواری حەمەی ئاورەحمان ئاغا و سالاری مستەفای مەلا حەکیم** هاتنە ژوورەوە. ملازم عومەر بەوانی ووت کاک نێچیروان بروسکەی کردووە بەیانی دەگات. ملازم عومەر بەکاک ئەیوبی ووت ئێشتان هەبوو کاک ئەیوب. کاک ئەیوب گوتی: ئێمە لە بازیان شوێنەکەمان زۆر خراپە ئەگەر هێزێکت بۆ ناردباین باش بوو. ملازم عمر گوتی هێز کوا؟ برۆن بەمام رۆستەم بلێن. مام رۆستەم لە حەوشەکەدا وەستا بوو، کاک ئەیووب پێی گوت، مام رۆستەم گوتی ئێمە هیچ هێزێکی زیادەمان لانیە زیاد بۆ ئیوەی بنێرین، بڕۆن خۆتان کردووتانە و خۆشتان بیپارێزن. من گەڕامەوە ناوێکم دا بە ملازم عومەر گوتم ئەم ناوە لێرەیە؟ گوتی ئەمەکێیە؟ گوتم مەسئول منزەمەی قەڵادزێیە و قەرزدارمە. گوتی بزانە لێرەیە، زۆر گەڕام نەبوو.

لەگەڵ کاک ئەیوب گەڕاینەوە بازیان. هەرچی جەیشی ناوچەی سلێمانیە. گشتی رووت و قوت، برسی و سەرتاپای گیانیان شەلاڵی ئاو بوو. بەو باو بارانە، بە پێ ڕیچکەیان بەستبوو بەرەو کەرکوک دەرۆیشتن. لە سلێمانیەوە وەڵامیان بۆ ناردین کە نەهێڵن یەك سەرباز بڕوات. ئێمەش سەیتەرەمان داناو هەموویانمان گێڕانەوە. دابەشمان کردن بەسەر ئەو خەڵکە هەژارەدا کە خۆی نانی نەبوو بیخوات. هەموو قووتابخانەکانمان پڕکرد لە دیل و خەڵکەکەش خواردنی بۆ دەبردن. سەربازێکی برینداریان لەگەڵ بو لاقی شکا بوو. پیاوێك هات وتی بیدەن بەمن لەبەر خاتری خوا خزمەتی دەکەم. کابرا سەربازەکەی برد بۆ ماڵیٚ خۆی.

مەبەستم لە گێڕانەوەی ئەم راپەڕین و رووداوانە، روون کردنەوەی راستی و وەبیرهینانەوەی کەناڵی میدیای کوردی ودەسەڵاتی کوردییە، کە ئەو رووداو و بە سەرهاتانەی بەسەر ئەم گەلە هاتووە، وەك خۆی بیگێڕنەوە و بۆ مێژوو تۆماری بکەن. و پەیامنێری کەناڵەکانی راگەیاندن لە کوردستان بۆ روونکردنەوەی راستی رووداوەکان، بگەڕێن ئەو کەسانە بدۆزینەوە کە لە ناو رووداوەکاندا بوون، باکەسێکی ئاساییش بێت. نەك دیمانە لەگەڵ ئەو کەسانە بکەن کە دووربەدوور ئاگایان لە



رووداوەکان بووە، یا ئەوەی کورسییەکەی پێبەخشیوە بۆی نووسیوەتەوە دەڵیٚ ئاوا بیگێڕەوە. ئیتر بۆی گرینگ نییە داخوا مێژوو دەشێوێنیٚ یان نا. تەنیا ئەوە گرینگە دەسەڵاتی سەرووی خۆی لێی رازی بێت و کورسییەکەی لەق نەبێت.

خەڵکی پشدەر لە زۆربەی بەرەنگاربوونەوە و راپەڕینەکاندا پێشەنگ بوون. زۆرجار رۆڵی سەرەکییان گێڕاوە. لە پێناوی خاك و ئازادی ئەم گەلەدا، قوربانییان داوە. رژێم ئەو خەڵکەی لە دەڤەر و خاکی باوباپیرانی دابڕیبوو، بەداخەوە دەسەڵات و میدیای کوردیش خەریکە لە مێژووی خەباتی خۆیان دایانبڕێت. دانیشتوانی ئەم ناوچەیە، دوای تێکچونی شۆڕشی ئەیلول زۆر ترین رێژەی قوربانیان دا. لە ساڵی ١٩٧٧ لەیەك رۆژدا (٩) نۆ رۆڵەی بەئەمەکی ئەم شارە لە سێدارەدران. لە ١٩٨٢/٤/٢٤ دا خەڵکی ژشدەر پێش هەموو شوێنێك راپەڕین. ئەو راپەڕینەش زۆربەی شارەکانی کوردستانی گرتەوە و، رژێم ناچار بوو بۆ دووبارە نەبوونەوە یا درێژەنەدان بە راپەڕین داوای گفتوگۆ لەگەڵ هێزەکانی پێشمەرگە بکات. خەڵکی پشدەر پێش شاری رانیە کە بە دەروازەی راپەرین ناودەبریٚ، لە رۆژی ٢/٣/ ١٩٩١ لە ئۆردوگای خەبات دوور لە ناوچەکەی خۆیان لە پیاوانی دوژمن هاتنە دەست. لە سەربان و کوچە و کۆڵانەکان دامەزران. راپەڕین دەستیپێکرد و شەهیدشیان دا کە یەکەم شەهیدی راپەڕین بوو بەناوی **بەختیار هوڕێوەیی**.

# وێنەی قەڵادزی سەرەتای حەفتاکان



وێنەی قەڵادزێ سەرەتای حەفتاکان





کەلاوەی قوتابخانەی قەڵادزێ



وێنەی قەڵادزێی  وێران دوای بۆمبارانی ٢٤/٤/١٩٧٤





نەورۆزی ساڵی ١٩٧٦ هۆڵی یانەی ماددی قەڵادزێ



قوتابخانەی ناوەندی و دواناوەندی/ دوای روخانی بە بۆردومانی ١٩٧٤/٤/٢٤ خەریکن بە کاڵ و کرچی نۆژەنی دەکەنەوە

# خۆپیشاندانی ٤/٧/١٩٨٢

**وێنەی خۆ پیشاندانەکان بە کامیرای عوسمان محەمەد میران بەنهێنی گیراوە ئەو رۆژە کامیرا لە هەرکەسێ گیرابا لە دەباخانەکەی موسڵ کەوڵیان دەکرد**







هاولاتییەك ماڵئاوایی لە ماڵە رووخاوەکەی دەکات







نووسەری ئەم نامیلکەیە چەند کاتژمێرێک پێش دەرکردنی لە ماڵەکەی خۆی



بطاقه مرحل

الاسم الثلاثي لرئيس العائله : مصلح الدين ابراهيم عبدالله

عدد افراد العائله : ٢ ثلاثه

محل السكن السابق : قلعه دزه

المنطقة التي يرحل اليها : بارزان

المحافظه :

المدينه الجديدة : ٢٨ / ٦ / ١٩٨٨

الجمهورية العراقية

قائمقامية قضاء بشدر
الحكم المحلي
الادارة العامة

العدد / ...
التاريخ ٢٠ / ٦ / ١٩٨٨

الى / لجنة الاستقبال / بارزان

م / ارسال عائلة

نرسل اليكم عائلة المواطن ( مصلح الدين ابراهيم عبدالله ) من مرحلي قضاء بشدر عدد نفوسه ( ٣ ) يرجى تخصيص قطعة ارض سكنية له حسب الاصول والتعليمات ...

قائمقام قضاء بشدر

كۆپی كارتی ڕاگواستن و كۆپی پسولەی وەرگرتن لەئۆردوگا، واتە ورقة استقبال





ڕەسوڵ شێت/ شێتێكی كوردپەروەر و هۆگری كەسایەتی باوكی نەتەوەیی كورد بارزانی نەمر بوو. هەرچەند شێت بوو، بەڵام هەڵوێست و وتەكانی جێگەی سەرنجی خەڵك بوون، ناوبراو دوای تێكچوونی شۆڕشی ئەیلول شێت بوو. وێری سەر زمانی ئەو شێتە، پێشمەرگە و بارزانی بوو



چەند هاوڵاتییەك دوای بێ ئومێد بوون بە ناچاری ماڵەكەیان بار دەكەن



**وێنەی شاری قەڵادزێی رووخاو کە**
**دانیشتووانەکەی دوای راپەڕین دەگەڕێنەوە بۆ ئاوەدانکردنەوەی**







سري وشخصي

٩. على الاجهزة الامنيه كسب أكبر عدد ممكن من المؤتمنين في المجمعات السكنيه لكشف التنظيمات الداخليه ومن يعملون في الزوايا المظلمه .

١٠. أن متابعة التنظيمات الداخليه من قبل استخبارات وأمن الفيالق والفرق يولد لنا بعض الاشكالات والمتاعب وعليه تحال هكذا أمور الى الاستخبارات أو الامن حسب الاختصاص وهم الذين يقومون بمتابعتها .

١١. عند حدوث عمل تخريبي في المناطق المحذوره أمنيا " فيكون ذلك من مسؤولية القطعات العسكرية أما داخل المجمعات والمدن فيكون ذلك من مسؤولية الاستخبارات والامن .

يرجى التفضل بالاطلاع ... مع التقدير .

العقيد الركن

مدير منظومة أستخبارات المنطقة الشرقية

١٤ أذار ٨٩

( ٣ـ٣ )

سري وشخصي

بەڵگەنامەی ژمارە 9

بسم الله الرحمن الرحيم

رئاسة الجمهورية
السكرتير
مديرية الاستخبارات العسكرية العامة
منظومة استخبارات المنطقة الشرقية

يرجى الاشارة الى الرقم كاملاً
(سجل الشهداء اكرم منا جميعاً)

٢١٩٤

سري وشخصي الرقم / ش٣/ ق٣/ / الاضبارة سعادة / ٢٠١١
التاريخ / ١٢ / آذار / ١٩٨٩
/ شعبان / ١٤٠٩

الى / مديرية الاستخبارات العسكرية العامة ( ش٣ )

الموضوع / محضر اجتماع

بالساعة ١١٠٠ من يوم ١١ آذار ٨٩ عقد اجتماع في قيادة مكتب تنظيم الشمال حضره السادة المحافظين وأمناء سر الفرع وقادة الفيالق ومسؤولي الاجهزة الامنيه وفيما يلي ملخص الامور التي تمت مناقشتها خلال الاجتماع :ـ

١. اشار الرفيق مسؤول المكتب في بداية حديثه الى ضرورة تدارس الوضع في الشمال بعد انتهاء عمليات الانفال وطرد المخربين خارج الحدود وإعادة النظر ببعض القرارات التي اتخذت في حينه لظروف استثنائيه .

٢. تم التركيز خلال الاجتماع على مسألة جوهريه وهي تحديد الاماكن المحذورة أمنياً والاماكن الغير المحذوره وكذلك المناطق التي من الممكن زراعتها والتواجد فيها نهاراً والانسحاب منها ليلاً وكذلك المناطق الممكن زراعتها والتواجد فيها ليلاً ونهاراً وقدم قادة الفيالق شرحاً مفصلاً من المناطق المشار اليها اعلاه وطالب منهم الرفيق مسؤول المكتب تثبيت ذلك رسمياً لكي يتم التعامل على اساسه بشأن الذين يتواجدون في المناطق المحرمه والمحذوره وأكد على ضرورة الرجوع الى توجيهات المكتب السابقة بصدد التعامل مع كل من يتواجد في المناطق المحذوره .

( ٣ـ١ )



سري وشخصي

٣. تأشير المناطق التي يزال عنها المحذور الامني وعلى المنظمات الحزبيه أن تنشط في مجال توعية المواطنين وتبصيرهم بالمناطق المحذوره والمناطق غير المحذوره والاجراءات التي ستترتب عليهم في حالة عدم الالتزام بما ورد أعلاه .

٤. تم القرار على ازالة كل ما موجود شرق سنكسر ( قلعه دزه والمجمعات التابعه لها ) وكل ما هو يسار بحيرة دوكان وشمال بيره مكرون ... على أن تباشر اللجان المختصه بتهيئة أماكن المجمعات المقترحه ويتم الترحيل في بداية شهر أيار من هذا العام مع ضرورة ملاحظة عدم الرغبه بسكن العشيره الواحده في مجمع واحد مما يخلق لنا بعض المتاعب مستقبلاً لأن الذي يقود هو الحزب القائد فقط .

٥. يتم اختيار المجمعات في محافظة السليمانية وفي حالة عدم وجود الرقعه الجغرافيه الكافيه اختيار مواقع للمجمعات في محافظة أربيل وكذلك الاستفاده من المجمعات السابقه والتي تتوفر فيها كافة الامور الخدميه الاخرى .

٦. المناطق المحذوره بسبب وجود النفط فيها تقلص الى الحد الادنى وتؤجر الى أشخاص مؤتمنين بعد جمعهم وأعلان المزايده فيما بينهم ويحرم من ذلك الذين كانوا يعملون ضمن صفوف التخريب .

٧. سبق وأن صدر توجيه من مكتب تنظيم الشمال بعدم سماع شكاوى المواطنين الذين يسكنون القرى المحذوره أمنياً ونظراً لأزالة تلك القرى وأسكان أهاليها في مجمعات مسيطر عليها من قبل الدولة وعليه فأنهم من حقهم تقديم الشكاوى ويلغى التوجيه السابق .

٨. لابد من مغادرة الصيغ الاستثنائيه وعدم الرجوع الى المكتب في كل شيء وعلى كل واحد منا أن يأخذ دوره بالكامل في مجال اختصاصه .

( ٣ـ٢ )

سري وشخصي

## سوپاس بۆ

- بەڕێز مامۆستا و دادوەر **تەها بابان** کە هانیدام ئەم بیروەرییانە بکەمە نامیلکەیەك.
- بەڕێز کاك **حەمە ئەحمەدجاف** ی شاعیر و ڕۆژنامەنووس کە پێداچوونەوەی بۆ ئەم بەرهەمە کردووە.
- دەریا جەمال حەویزی مامۆستای زمان و ئەدەبی کوردی لەزانکۆی کۆیە..
- **مستەفا غەفور** کە دوای وێراستاری تا بە چاپگەیشتنی ئەم نامیلکەیە خەمخۆری بوو.
- کاك هەرێم **عبدولڕحمان** لە کۆیە...

بەڕێزان **عوسمان میران، ئیبراهیم حەمە عەلی** و **مامۆستا جەبار تاهیر** کە لەو ئان وساتە دژوارەدا توانیویانە ئەو وێنانە بگرن.